# بنەماکانی

# ڕاهێنانی ڕاهێنەران


نووسینی

د. طلال الصغير     د. عبدالله هنانو

م. دانا فاضل     م. مهدي رمضاني

م. صلاح الدين جيلح

وەرگێڕانی

ڕاهێنەر/ پشتیوان جمال









❖ ناوی کتێب : ( بنەماکانی ڕاهێنانی ڕاهێنەران )

❖ بابەت : TOT

❖ وەرگێڕان : پشتیوان جەمال ئەحمەد

❖ پێداچونەوەی زمانەوانی : ئاوات ئەبوبەکر ئەحمەد

❖ هەڵەبڕی : ئاوات ئەبوبەکر ئەحمەد

❖ دیزاین : هونەر عوسمان

❖ تیراژ : ٥٠٠

❖ نۆبەرەی چاپ : یەکەم ٢٠١٩

❖ کوردستان - سلێمانی

❖ چاپخانەی : ناوەندی سارا

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژ ( ١٨٤٣ ) ی ساڵی ( ٢٠١٩ ) ی دراوەتێ.



Global Academy of Training quality & Talint Development

Email : gatqtd@ gmail.com

www.gatq.org

tel: ٠٠٩٦١٧٠٧٢٢٢٤٠

# بەناوی خودای بەخشندەی میهرەبان

خوێنەری بەڕێزو خۆشەویست:

ئەم پەڕتوکە بە یەکێك لە بەرهەمە نوێیەکان دادەنرێت بۆ ئەو ڕاهێنەرە نوێیانەی ڕێگای ڕاهێنانیان گرتۆتەبەر, کۆمەڵێك پێداویستی سەرەکی لەخۆی گرتووە کە پێویستە ڕاهێنەر بەچاکی لەبەری بکات و جێبەجێی بکات پێش ئەوەی بچێتە گۆڕەپانی ڕاهێنانەوە.

ڕاهێنەر هاوبەشە لە ڕاپەڕاندنی کۆمەلگا ئەویش بە ﴿بەخشینی زانیاری پێیان و فێرکردنی مەهارەیەك و گۆڕینی بۆچونەکانیان بەرەو باشتر.﴾

داواکارین لە خودای گەورەو میهرەبان ئەم کارەمان لێوەربگرێت، یارمەتیدەرمان بێت بۆ خزمەتکردن بە کۆمەڵگاکەمان و بەردو پێشبردنیان بۆ ئەو کارانەی سود بەخشە بۆیان.

# پێشەکی

ئـەمرۆ لـە جیهانێکـدا دەژیـن گۆڕانکارییـەکان زۆر بـەخێرایی تیایـدا ڕودەدەن، سەرەڕای بڵاو بونـەوەی ژمارەیـەکی زۆریش لـە پـەرتوک و بونیان لـەناو کتێبخانەکانـداو نمایشـکردنی هـەمو جـۆرو بابـەتێکی نـوێ لەلایـەن دەزگاکانەوە.... ئەم هەمو گۆڕانکاریە خێرایانە سروشتێکی وایان کردووە کە ئەو کەسانەی هەوڵ نادەن و تواناکانیان ناخەنە گەڕ قبوڵ نەکرێن.

لـە سـێبەری گـەڕان بـە دوای گۆڕانکاریـە تەکنـەلۆژی و سـەرکەوتنە پیشەیەکانداو لەبەر پێویستی پێشخستنی تواناکان و نوێکردنەوەی بەردەوامی زانیارییـەکان بـۆ ئامـادەکردنی توانـا مرۆیـەکان و گەشـەپێکردنیان و بەرزکردنـەوەی ئاسـتی ئـەداو چـاکردنی جێبەجێکردنـەکان و بەمەبەسـتی پڕکردنـەوەی هـەمو ئـەو بۆشـاییانە ئـەو شـتە دەرکـەوت کـەپێی دەوترێت: «ڕاهێنان».

پێویستی کۆمەڵگا بـۆ ڕاهێنـان ڕۆژ لـەدوای ڕۆژ لـە هەڵکشاندایە بـە هـەمان شـێوەی بازاڕەکـان، هـەتا گەشـتنە ئاسـتی ژمـارەی ڕاهێنـەرەکان نـەتوانن پێویستیەکانی ڕاهێنان پڕبکەنەوە، لەبـەر ئـەو هۆکارانـە بیرمـان کـردەوە لە دامەزراندنی «ئەکادیمیای جیهانی بۆ باشترین جۆری ڕاهێنـان و پەرەپێـدانی بەهرەکان GATQ» بـۆ ئـەوەی بتـوانین پـەرە بـە بەرنامـەکانمان بدەین بۆ پێگەیانـدنی زۆرتـرین ڕاهێنـەر کـە بتـوانن تێکەڵیـەك دروستبکەن لـە نێوان زانیاری و تیۆری و مەشق پێکردنی کرداری بەپێی پێوانە جیهانیەکان.

*پشتیوان جمال /سلێمانی/٢٠١٩*

## بۆچی ڕاهێنان بە پڕۆگرامی ئەکادیمی ؟

بەرنامەی ڕاهێنەری لێهاتو (محترف) سیستەمێکی تەواوە بە پڕۆگرامێکی ورد ئامانجی پێشکەشکردنی چەند ڕێگاو شێوازێکی ستراتیژی گونجاوە بە ڕاهێنەر بەمەبەستی بەرزکردنەوەی ئاست و پێشکەشکردنی باشترین ئاکام.

**ئەم شتانەی تێدایە:**

- **دەوروبەرێکی ئەرێنی:** ڕاهێنراوەکان ئەگەر ژیانیان لە بارێکی گونجاودا بو دور لە کێشەی مادی و سۆزداری و کۆمەڵایەتی ئەوکاتە زۆر بەئاسانی و بە باشترین ڕێگە فێردەبن, بەشداریکردن و ئاسایش و سود وەرگرتن و خۆشی کۆمەڵێك سەرچاوەن کە ڕۆڵیان هەیە لە بەرزکردنەوەی ڕێژەی تێگەیشتن.
- **بەشداریکردنی ڕاهێنراوەکان:** ڕاهێنراوەکان ئەگەر بە کۆمەڵی بەشداریان پێبکرێت ئەوا باشتر سود وەردەگرن لە ڕاهێنانەکەو زیاتر هەست بە لێپرسراوێتی دەکەن.
- **هاوکاریکردنی نێوان ڕاهێنراوەکان:** بە گشتی ڕاهێنراوەکان زیاتر تێدەگەن لەبارێکی هاوکاریدا لەگەڵ یەکتر.
- **جۆراوجۆرکردن لە هەمو جۆرەکانی فێرکردنەکاندا:** ڕاهێنراوەکان زیاتر تێدەگەن ئەگەر پێداویستی جۆراوجۆریان لەبەردەستدا بێت بۆ

ئـەوەی بــە ئـارەزوی خۆیـان بــەکاری بهێـنن و لەگـەڵ حەزەکانیانـ
بگونجێت.

- فێربون لەڕێگەی ( السیاق): ئەگەر ڕاهێنراوەکان زانیاریەکانیان لە ڕێگـەی تەلقینیـەوە وەرگـرت ئـەوا وەرگـرتنی قورسـەو لەبیرچونەوەشی ئاسانە, بۆیـە باشـترین فێربـون لـە ڕێگـەی کـرداری کەسـیەوە بکرێت لە چوارچێوەیەکی واقعی و سودوەرگرتن لـە (التغذیـة الراجعـة)و چاودێری کردن و هەڵسەنگاندن و بیرکردنەوەو کات و داهێنان و چالاکی کردن.
- دیاریکردنی ئامانجـەکانی ڕاهێنـان: بەدەسـتهێنانی ئـەنجامی باش لەکۆتایی ڕاهێنانەکە.

## ناوەڕۆکی ڕاهێنانەکە:

نەخشـەی نـاوەڕۆکی ڕاهێنانـەکان لـە بەرنامەیـەك پێکهـاتووە بـەپێی دابەشـــکردنەکانی ڕاهێنـــەر لـــە ئـــەکادیمیادا, هـــەرجۆرێکیش لـەو دابەشکردنانە داواکاری زانیاری و مەهاری و سلوکی تایبەتی خۆی هەیە لەو ڕوانگەیـەوە ئـەوەمان بـینی کـە ڕاهێنـەر لـەم ئاسـتەدا پێویستی بە ناسینی ئەو بنەمایانە هەیە بۆ ئەوەی ڕاهێنانەکەی لەسەر بنیـات بنێت مەهارەکانیش بە هەمان شێوە .

## ئامانجەکانی بەرنامەی ڕاهێنانی ڕاهێنەران

- بەهێزترکردنی خاڵە بەهێزو سەرکەوتنەکان لە ڕاهێناندا.
- ڕێکخستن و بەڕێوەبردنی کرداری ڕاهێنانەکە.
- شیکردنەوەی پێداویستیەکانی ڕاهێنەرو دابین کردنی.

- بەدەستهێنانی ئەو ڕێگایانەی کرداری ڕاهێنانەکە کاریگەرتر دەکات بۆ زیادبونی کاریگەری تێگەیشتنەکە.
- بەدەستخستنی ڕێگاکانی شیکردنەوەی پێداویستیەکانی ڕاهێنان و دابەشکردنی بۆ ئاستی دیاریکراو بۆی.
- دیاریکردنی ئامانجەکانی ڕاهێنانەکە بە شێوەیەکی ڕون و نەخشەکێشانی بەرنامەیەکی کرداری بۆی.
- گەشەپێکردنی مەهارەکان و خۆئامادەکردن بۆ کاریگەرترکردن و هەڵسەنگاندنی ڕاهێنانەکە.
- هەڵسوکەوتکردنی باش لەگەڵ ڕاهێنراوەکان و دەستپێش خەریکردنی گونجاو لەکاتی کردارەکانی ڕاهێنانەکە بە ڕێگایەکی کاریگەر.
- دڵنیابونەوە لە ئامادەبونی کەسایەتی ڕاهێنەرەکە, بەواتای دەرخستنی بەهرەی پەیوەندی کەری باش بە نیازی هاندانێکی باش بۆ ئامادەبوان و پێشخستنی لەڕاهێناندا.
- ڕێگرتن و ڕێکردنی دڵەڕاوکێ و هەستەکانی ڕاهێنەر لەبەردەم جەماوەردا.
- بەکارهێنانی پێداویستیەکان بۆ پێوانەکردنی توانای ڕاهێنانەکە لەئاستی نەخشەو پێداویستی و ڕاهێنان و ڕێکخستن و کاریگەری و بەدەستخستنی تواناو زانیاریە نوێیەکان بۆ بەشداربو.
- توندوتۆڵکردن و دروستکردنی ستراتیژیەکی ورد بۆ کەسایەتی ڕاهێنەرو بەهێزکردنی باوەڕپێکردنی لە بەردەم کۆمەڵە جیاجیاکاندا .

## ئاستەکانی پرۆگرامەکە

لە پرۆگرامی خولەکانی ڕاهێنان لە ئەکادیمیاکەمان دوئاست هەیە:

ئاستی یەکەم : باوەڕپێکراوی بنەڕەتی.

ئاستی دووەم : باوەڕپێکراوی پێشکەوتو.

ئاستی یەکەم: ڕاهێنەری باوەڕپێکراو. [Certified Training TOT 1]

## ئامانجی گشتی بۆ ئاستی یەکەم لە خولی ڕاهێنەران:

ئامانجی ئەم ئاستە لە ڕاهێنانی ڕاهێنەران، مەهارە بنەڕەتیەکان ببەخشرێت پێیان بۆ پێشکەشکردنی بەرنامەی ڕاهێنانەکە بە باشترین شێوازو پێداویستی و ڕێگەکانی ڕاهێنانی گونجاو بۆ بەشداربوان خاوەنداریێتی مەهارەو پێشکەشکردن و نمایشکردن.

دەرچەکان (مخرجات)ی ئاستی یەکەم لە بەرنامەی ڕاهێنانی ڕاهێنەران:

لە کۆتایی ئەم بەرنامەی ڕاهێنانەدا هەمو ڕاهێنەرێك توانای دەبێت کە:

- ئامانجەکانی ڕاهێنان بنوسێت بە بەکارهێنانی پۆلێنەکانی بلوم.
- سەرچاوەکانی دەنگ جیابکاتەوە.
- جیاوازی بکات لەنێوان بەرپرسیارێتی قسەکەرو گوێگر لە خوردوشتدا.
- هانی ڕاهێنراوەکان بدات.
- ژینگەیەکی ڕاهێنانی تەندروست دروستبکات.

- توانا سەرەکیەکانی هەریەك لە جۆرەکانی فێربون جیابکاتەوە.
- گفتوگۆ کۆمەڵیەکان بە لێهتویەوە بەڕێ دەکات.
- شێوازە تەقەنیەکانی دەربرینەکان جگە لە زمان بۆ بەرامبەر دابمەزرێنێت.
- گفتوگۆکان بەڕێوە دەبات لەگەڵ خوێندەوارەکان (ڕۆشنبیرەکان)
- پێداویستیەکانی ڕاهێنان شیبکاتەوە.
- نمایشێکی ڕاهێنانی سەرکەوتو کاریگەر بە جەماوەر ببەخشێت.
- ژمارەی کاتژمێرەکانی بەرنامەکە ﴿٦ ڕۆژە یان ٣٠ کاتژمێرە بەنزیکەیی﴾

## ئەو بەرنامەیە بۆ کێیە؟

ئەم بەرنامەیە بۆ ئەو ڕاهێنەرو مامۆستا نوێیانەیە کە پێشتر بەشداری خولی ڕاهێنانیان نەکردووە.
بەڕێوەبەرو بەرپرس و ڕاهێنەری مەشقەکە حەزی بەدەست خستنی بڕوانامەی باوەڕپێکراو یان گەشەپێدان و پەرەپێدانی تواناکانیان لە ڕاهێناندا, بۆ هەمو ئەو کەسانەیە کە ئارەزویان بە چونە ناو کاری ڕاهێنانە بە پێوانە جیهانیەکان.

## نایابێتی بڕوانامەکە [امتیازات الاعتماد]

- بڕوانامەیەکی تایبەت بە TOT .... ڕاهێنانی ڕاهێنەران بۆ ئاستی باوەڕپێکراوی بناغەیی ﴿معتمد اساسی﴾.
- بەخشینی پشت بەستنی ئەکادیمیا بە ڕاهێنەرەکە بۆ ماوەی یەک سالٚ ﴿اعتماد لمدة سنة﴾.
- ناسنامەی ڕاهێنەرایەتی ﴿مدرب معتمد﴾.
- دەرسی ڕاهێنەرایەتی ﴿مدرب معتمد﴾.
- تۆمارکردنی ناوی ڕاهێنەر لە سایتی ئەکادیمیاکەدا.
- بەخشینی ژمارەیەکی نهێنی تایبەت بە ڕاهێنەر خۆی لە ئەکادیمیاکە.

## ڕاهێنەرانی خولەکە [بەرنامەکە]

ئەو ڕاهێنەرانەی لە ئاستی یەکەمی ڕاهێنەراندان لە ئەکادیمیای جیهانی بەتایبەتی هەڵدەستن بە پێشکەشکردنی خولی ڕاهێنانەکە ئەوانیش ناویان لە ئەکادیمیادا بە ناونیشانی ﴿ڕاهێنەری ڕاهێنەران﴾ تۆمارکراوە.

## باجەکانی [اعتماد ]

١٠٠$ بۆ هەمو بەشداربویەك لەبەرنامەکە بە هەمو ئیمتیازەکانەوە.

## تەوەرەکانی ڕاهێنانی خولەکە :

### تەوەرەی یەکەم : بنەماکانی ڕاهێنان

ماوەی ڕاهێنان لەڕۆژێکدا (٥) کاژێر.

- سەرچاوەکانی تەوەرەکە
- فێربون (فێرکردن ) — ڕاهێنان.
- بیردۆزەکانی فێربون— ڕاهێنان— (غانیە— بلوم- فورمان).
- سیفاتەکانی ڕاهێنانی کاریگەر.
- بازنەکانی ڕاهێنان.
- مێژوی ڕاهێنان.
- ئاستەکانی ڕاهێنەر.
- پۆلێنکردنی جۆرەکانی ڕاهێنەران.
- متمانە لە جیهانی ڕاهێناندا.

### تەوەرەی دووەم :

## شیکردنەوەی پێداویستیەکانی ڕاهێنان

ماوەی ڕاهێنان «یەک» ڕۆژ.... پێنج کاژێر.

- سەرچاوەکانی تەوەرەکە

- پێناسەکردنی پێداویستیەکانی ڕاهێنان،
- دارشتنەوەی ئامانجەکە.
- تەرخانکردن و شیکردنەوەو دیاریکردنی پێداویستیەکانی ڕاهێنان.

-کلیلەکانی نەخشەکێشان بۆ دیاریکردنی پێداویستیەکانی ڕاهێنان.

-دەرکردە سەرەکیەکان بۆ دیاریکردنی پێداویستیەکان.

-نیشانەکانی پێداویستیەکانی ڕاهێنان.

-سەرچاوەکانی ناسینی پێداویستیەکانی ڕاهێنان.

-شێوازەکانی ناسینی پێداویستیەکانی ڕاهێنان.

## تەوەرەی سێیەم : ستراتیژیەکانی ڕاهێنان

ماوەی خولەکە.... یەك ڕۆژ.

### ●سەرچاوەکانی تەوەرەکە:

- پێناسەکردنی ستراتیژیەکانی ڕاهێنان.
- پێوانەکانی هەڵبژاردنی شێوازەکانی ڕاهێنان.
- هەڵبژاردنێکی گونجاو بۆ پێداویستی و شێوازەکانی ڕاهێنان.
- ئامێرەکانی فێربون لەلای گەورەکان.
- ئەرێنی و نەرێنی بەکارهێنانی هەرشێوازێك.
- شـــێوازە ئاســـانەکان بـــۆ کردارەکـــانی وەرگـــرتن و لەبـــەرکردن! بیرکەوتنەوە.
- یاریەکانی ڕاهێنان.

## تەوەرەی چوارەم :

کاریگەرکردنی دیدارەکانی ڕاهێنان

ماوەی ڕاهێنان : دوو ڕۆژ

● سەرچاوەکانی تەوەرەکە

- جۆرایەتی وتار.
- بنەماکانی وتاری بنەڕەتی.
- بنەماکانی وتاری بێدەنگی.
- گوێگرتن و گوێ لێگرتن.
- سەرچاوەکانی پەیوەندیکردن.
- پرسیارە ڕێکخراوەکان.
- ڕێکخستنی ژێرخانی وتار.
- شێوازەکانی وتار.
- ڕێکخستنی هۆڵەکە.
- جۆرەکانی ڕاهێنراوەکان.

تەوەرەی پێنجەم :

بەرزکردنەوەی لێهاتویی ڕاهێنەرو بەهێزکردنی :

ماوەی بەهێزکردنەکە ( یەک ) ڕۆژ.

● سەرچاوەکانی تەوەرەکە:

-پێشکەشکردنی نمایشی ڕاهێنانی تاکەکەسی
- پێشکەشکردنی لیژنەی بەهێزکردنەکە (تغذية راجعة ).
- هەڵسەنگاندنی کارەکە.

## دووەم: ڕاهێنەری باوەڕپێکراوی پێشکەوتو [مدرب معتمد متقدم] TOT٢

### ئامانجی گشتی ئاستی یەکەم لە خولی ڕاهێنەرەکان :

ئەم ئاستە لە ڕاهێنانی ڕاهێنەران ئامانجی بەخشینی مەهارەیەکی پیشەیی پێشکەوتوە بە بەشداربوان لە ڕاهێنەران، هەروەها پوختەکردنی مەهارەو بەهێزکردنی تواناای خۆییان.

### دەستکەوتەکانی ئاستی دووەم لە بەرنامەی ڕاهێنانی ڕاهێنەران:

لە کۆتایی بەرنامەی ڕاهێنانەکەدا هەمو ڕاهێنەرێك تواناای دەبێت کە:

- کردارو هەڵسوکەوت لەگەڵ ڕاهێنەری قورسدا بکات.
- هەڵسوکەوت لەگەڵ ئەو کێشانە بکات لە کاتی جێبەجێکردندا دێنە ڕێگەی.
- گفتوگۆکان لەگەڵ بەشداربوان بە شێوەیەکی کاریگەر بەڕێوەبەرێت.
- پاکێجێکی بچوکی ڕاهێنان بۆ خۆی دروست بکات.
- بەرنامەکە بەگشتی لە شەش ڕۆژ پێکدێت، نزیکەی ٣٢ کاژێر.

### ئەم بەرنامەیە بۆ کێیە؟

ئەم بەرنامەیە بۆ ئەو ڕاهێنەرا نەیە کە ڕاهێنان دەکەن و دەیانەوێت تواناکانی خۆیان لەڕاهێناندا زیاتر بەهێزبکەن و بگوازرێنەوە بۆ ئاستی ئیها تویی (الاحترافیە).

ئـەو ڕاهێنەرانـەی ئاسـتە بنەڕەتیـەکانی ڕاهێنانیـان بڕیـوە لـە خـولی ڕاهێنەرەکان، هەروەها بۆ ئەو کەسانەی دەیانەوێت ناونیشانی خۆیان لە (ڕاهێنەری باوەڕپێکراو) بگۆڕن بۆ (ڕاهێنەری بنەڕەتی پێشکەوتو).

**جیاکەرەوەکانی باوەڕپێکردن (امتیازات الا عتماد )**

- بڕوانامەیەکی تایبەتی ﴿TOT﴾ ڕاهێنان بۆ ئاستی پێشکەوتوان.
- متمانەکردنی ڕاهێنەر بۆ ماوەی ساڵێك.
- وانەی ئەکادیمی ﴿ڕاهێنەری پێشکەوتو﴾.
- ناسنامەی متمانەپێکراوی ﴿ڕاهێنەری پێشکەوتو﴾.
- تۆمارکردنی ناوی ڕاهێنەر لە سایتی ئەکادیمیاکە.
- بەخشـینی ژمارەیـەکی تایبـەت بـە ڕاهێنـەر خـۆی وەك ڕاهێنـەرێکی پێشکەوتو لە ئەکادیمیدا.

**ڕاهێنەرانی بەرنامەکە :**

ئەو ڕاهێنەرانە هەڵدەستن بە ڕاهێنان پێکردن بە ڕاهێنەرانی خـولی ٢ ( TOT ) لـە ئاسـتی دو کـە لـە ئـەکادیمیاوە ناویـان تۆمـارکراوەو ڕاهێنەری ڕاهێنەرانن و باوەڕپێکراوی ئەکادیمیاشن.

لە خولی دروستکردنی پاکێجی ڕاهێنان ئەو ڕاهێنەرانـە هەڵدەسـتن بـە ڕاهێنان پێکردن کە جێی متمانەن لەلایەن ئەکادیمیاوە.

لە دوای دروسـتکردنی پـاکێجی ڕاهێنـان لەسـەر سیسـتەمی ﴿ SMART MATREX﴾ کـە سیسـتەمێکی تایبەتـە بـە ئەکادیمیاکەمانـەوە بـۆ

دروستکردنی پاکێجی ڕاهێنان، یان بە سیستەمێکی هاوشێوە کە هەم
ئامانجی هەبێت.

پارەی خولەکە(١٠٠$)ی ئەمریکیە بۆ هەربەشداربویەك بە هەمو
ئیمتیازەکانەوە.

## تەوەرەکانی ڕاهێنان لەخولەکەدا :

### تەوەرەی یەکەم: بازاڕسازی ڕاهێنەر

### [تسویق المدرب] [دروستکردنی ناسنامە ]

ماوەی ڕاهێنانەکە : تەنها یەك ڕۆژە.

## سەرچاوەکانی تەوەرەکە :

- پێناسەکردنی بازاڕسازی (تسویق).
- هەنگاوەکانی چونە ناو بازاڕ.
- دروستکردنی وێنەیەکی خەیاڵی.
- ئامانجەکانی ڕاهێنان لەخولەکە.
- ناسینی بازاڕی ڕاهێنان.
- چۆنیەتی چونە ناو بازاڕەکانی ڕاهێنان.
- ناسینی چۆنیەتی بەرزبونەوەو گواستنەوە لە ئاستی ڕاهێنەری ناوخۆیی بۆ ڕاهێنەری نێودەوڵەتی و پاشان جیهانی.
- دروستکردنی هەل لە بازاڕەکانی ڕاهێناندا بۆ بونیاتنانی مارکەی کەسایەتی لە بازاڕەکانی ڕاهێناندا.

تـەوەرەی دووەم : هونـەری کرداریکـردن لەگـەڵ کێشـەکانی ڕاهێنان

ماوەی ڕهێنانەکە تەنها دوو ڕۆژە

سەرچاوەکانی تەوەرەکە :

- کرداری ڕاهێنان و ئامانج لێی.
- بەڕێوەبردنی کرداری ڕاهێنانەکە.
- هەڵوێستە نامۆکان ﴿ناخۆشەکان﴾.
- دیاریکردنی کێشەکە.
- چارەسەرکردنی کێشەکە.
- گۆڕینی چوارچێوەی پەیپێبردن ﴿ئیدراك﴾.
- بیمەکردنی بەردەوامی کرداری ڕاهێنانەکە.
- بەدیهێنانی ئامانجی ڕاهێنانەکە.

تـەوەرەی سـێیەم : بنـەماکانی ئامـادەکردن و دروسـتکردنی پاکێجەکانی ڕاهێنان

ماوەی ڕاهێنانی خولەکە دو ڕۆژە (١٢ کاژێرە).

سەرچاوەکانی تەوەرەکە:

- تێگەیشتن لە پاکێجەکانی ڕاهێنان.
- جۆرەکانی پاکێجەکانی ڕاهێنان.
- ناوەڕۆکی پاکێجەکانی راهێنان.
- هەیکەلی پاکێجەکانی ڕاهێنان.
- خانەداری ﴿مصفوفە﴾ پاکێجەکانی ڕاهێنان .

تەوەرەی چوارەم :

## بەرزکردنەوەی توانای ڕاهێنەرو بەهێزکردنی

ماوەی بەهێزکردنەکە تەنها یەك ڕۆژە.

### سەرچاوەکانی تەوەرەکە

- پێشکەشکردنی نمایشی ڕاهێنان بەتاکە کەسی.
- پێشکەشکردنی نمونەی پاکێجێکی بچوکی ڕاهێنان.
- پێشکەشکردنی﴿تغذية راجعة﴾ لەلایەن لیژنەی هەڵسەنگاندنەوە.
- هەڵسەنگاندنی کارەکە.

# GATQ

## ئەكاديمياى جيهانى بۆ باشترين جۆرى ڕاهێنان و پەرەپێدانى بەهرەكان

سەرەتاى دروستبونى ئەم پرۆژەيە لە دەوڵەتى ئيماراتى عەرەبى يەكگرتو سالى ٢٠٠٨ سەرى هەڵدا بۆ دروستكردنى ڕيكخراوێكى عەرەبى ڕاهێنان بۆ ڕاهێنەرە عەرەبەكان وەك بەديلێك بۆ ڕێكخراوە بيانيەكانى ئەمەريكى و كەنەدى, بۆيە ئەكاديمياكەمان هەستا بە هەڵكردنى ئالأى ڕوبەڕوبونەوەو ئەو ئەركە قورسەى خستە ئەستۆى خۆى بۆ خزمەتكردنى ڕاهێنەرە عەرەبيەكان بەتوانا ناوخۆييەكانى لەڕێگاى ئەم ئامانجانە:

- ئيعتمادكردنى سەنتەرەكانى ڕاهێنان و پێشكەشكردنى پشتگيرى بۆيان.
- پێشكەشكردنى ڕاوێژو توێژينەوەو يارمەتيەكان بۆيان لە بوارى و بەرهێنانى مرۆيى.
- بلأوكردنەوەو چاپكردنى ئەو پەڕتوك و ناميلكانەى لە بوارى ڕاهێنان و ڕاوێژكارى و پەرەپێدانى خۆيى دەنوسرێن.
- بونياتنانى پەيوەندى هاوكارى و گۆڕينەوەى زانياريەكان لەگەڵ هەر لايەنێكى نيشتمانى يان بيانى كە لەو بوارەدا كاردەكەن.
- ڕێكخستنى كۆنگرە ناوخۆيى و نێودەوڵەتيەكان.

• سەرپەرشتیکردنی ئەو چالاکیە ڕاهێنانەی لە بواری پەرەپێدان و گەشەی مرۆیدا لە ولاّتانی عەرەبی و جیهان سازدەکرێت.

• دەزگای ئەکادیمیاکەمان لە سنوری ئەو دەسەلاّتەی هەیەتی هەمو ئەو کردارانە جێبەجێ دەکات کە پەیوەندی بە بابەکانیەوە هەیە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ، هاندانی گەشەکان بەپێی ئەو یاساو ڕێکخستنانەی کاری پێدەکرێت.

## بوارەکانی پەیامەکەمان :

کارەکانمان لە سێ بواری سەرەکیدا خۆیان دەبیننەوە :

١. دانان و گەشەپێکردنی پێوانەکانی جیهانی عەرەبی بۆ ڕاهێنان.

٢.پێشکەشکردنی ئیعتماد بە سەنتەرەکان و بەرنامەی ڕاهێنانەکانیان

٣. دابینکردنی هەلی هاوکاریکردنی نێودەولّەتی و گۆڕینەوەی شارەزاییەکان لە نێوان سەنتەرەکانی ڕاهێنانەدا.

## [دامەزراوەیەکی عەرەبی... بلاّوبونەوەیەکی جیهانی]

دوای بەدی هێنانی قۆناغی بلاّوبونەوە لەسەر ئاستی جیهان قۆناغێکی نوێ هاتە ئاراوە کە بریتی بو لە ڕەگداکوتانی ئەم بلاّوبونەوەیە لە ڕێگەی ئاسنامەیەکی نوێوە بە ناوی ﴿***ئەکادیمیای جیهانی بۆ باشترین جۆری ڕاهێنان و پەرەپێدانی تواناکان***﴾ بۆ خزمەتکردنی ڕاهێنەرە عەرەبەکان کە لە ولاّتە جیاجیاکانی جیهاندا بلاّوبونەتەوە بە ڕەچاوکردنی بەهاکانمان کە لەم شتانە خۆی دەبینێتەوە :

• کرداری دەزگایی.

- پێوانەو ئاماژە قیاسیەکان (المعاییر).
- ڕەوشتەکانی ڕاهێنان.
- پسپۆڕی.
- لێکۆڵینەوەی زانستی.
- جۆرایەتی و داهێنان و پەرەپێدانی بەردەوام.
- بەردەوامی.
- هاوکاریکردن و گۆڕینەوەی بەرژەوەندیەکان.
- ئینتیمابون بە جیهان.

**ئـەکادیمیای جیهـانی بـۆ باشـترین جـۆری ڕاهێنـان و پەرەپێدانی تواناکان ئامانجی بریتیە لە:**

- پەرەپێدانی ئاماژەکان بۆ پێوانەکردنی جۆرێتی ڕاهێنان.
- بەرزکردنەوەی ئەو ڕێژەیەی لە ڕاهێنانەوە دەست دەکەوێت

.

## پێوانەکان پێشدەخەین ........ پەیوەستین بە جۆرایەتیەوە

# GATQ

### کورتەیەکی مێژویی :

• بونیادنـانی «ئـەکادیمیای جیهـانی بـۆ باشـترین جـۆری ڕاهێنـان و پەرەپێـدانی تواناکـان» لـە مـانگی یۆلیـۆی سـاڵی ٢٠٠٨ لـە شـاری «ئـەبوظبـی» دوای کۆبونـەوەی کۆمـەڵێک لـە نوێنـەرانی سـەنتەرەکانی ڕاهێنان کە دەوڵەتی ئیماراتی عەرەبی گرتبویە خۆی سەری هەڵدا.

• لـە مـانگی دیسـەمبەری ٢٠٠٨ بەشـێوەیەکی فـەرمی لـە شـاری «نیۆیۆرک» ئەکادیمیاکە لە ژێر ناوی «ئـەکادیمیای نێودەوڵـەتی عەرەبی بۆ پەرە پێدان و ڕاهێنان«AIA. TD» دامەزرا.

• لەپاش بەستنی کـۆنگرەی دامەزرانـدن لـە ئـەمارەتی «الفجرە» لە مانگی ئیبریلی ٢٠٠٩ ناوی ئەکادیمیاکە گـۆڕدرا بـۆ «ئـەکادیمیای عەرەبی جیهـانی بـۆ پـەرە پێـدان و ڕاهێنـان AG.ATO» کـە لـە دەوڵەتی ئیمـاراتی عەرەبیـەو بڕیـاری کردنـەوەی نوسـینگەی جێبـەجێکردن درا سەرەڕای مانەوەی نوسینگەکەی ئەکادیمیا لە نیۆیۆرک.

• لە مانگی یونیوی ٢٠١٠ لە دیمەشقی پایتەختی وڵاتی سوریا کۆنگرەی دووەم بەسترا بە بەشداریکردنی(٣٢) سەنتەری ڕاهێنان لـە (١٦) دەوڵەتی عەرەبی.

لەم کۆنگرەیەدا بڕیاردرا نوسینگەی فەرمی و سەرەکی ئەکادیمیاکە بگوازرێتەوە بۆ (بەیروت)ی پایتەختی (لوبنان).

● لە مانگی دیسەمبەری ٢٠١٠ دا ئەکادیمیاکەمان بە شێوەیەکی فەرمی لە شاری بەیروت بە نوێنەرایەتی سەنتەرەکانی ڕاهێنان لە (١٢) دەوڵەتی عەرەبیدا تۆمارکرا.

پاشان ئەکادیمیا بەرەو فراوانی ڕۆشت و لە مانگی یونیۆی ٢٠١١ لە وڵاتی تورکیا کۆنگرەی سێیەمی بەسترا.

## ئەکادیمیاکە

● زۆرترین ئەو هۆکارانەی بون بەهۆی دەرکەوتنی لە ساڵی ٢٠١٢ لە جەزائیر کۆنگرەی چوارەمی بەسترا.

● ساڵی ٢٠١٣ کۆنگرەی پێنجەمیشی لە عەمان بەسترا.

● ساڵی ٢٠١٤ کۆنگرەی شەشەمی لە شاری هەولێری پایتەختی هەرێمی کوردستان بەسترا.

● ٢٠١٥ کۆنگرەی حەوتەم لە وڵاتە یەکگرتوەکان بەسترا.

● ٢٠١٦ کۆنگرەی هەشتەمی لە کوالالامبور لە مالیزیا بەسترا.

● ٢٠١٧ کۆنگرەی نۆیەمی لە شاری باکۆی پایتەختی ئازەربایجان سازدرا.

● ٢٠١٨ کۆنگرەی دەیەمی لە ئەستەنبوڵ ئەنجامدرا.

## هۆکارەکانی بونیادنانی

١. پێویستی جیهانی عەرەبی و ئیسلامی بە دەزگایەکی پسپۆڕ لە بواری ڕاهێنان و پەرەپێدان بۆ ئەوەی وەك مەرجەعێکی کارگێڕی و ئەخلاقی لە کاتی پێویستدا بگەڕێینەوە بۆی.

٢.بلاوبونەوەی کۆمەڵێکی زۆری سەنتەرەکانی ڕاهێنان و ئیعتمادکردن بەناوی ئەوەی کە سەر بە سەنتەرو زانکۆکانی ئەمەریکاو کەنەدا و هەندێکی ترن.

٣. دەرکەوتنی هەندێك لایەن کە پارەیەکی زۆر لەو ڕێگەیەوە پەیدادەکەن و کردویانە بە پیشەیەکی بازرگانی.

٤. دواکەوتن و جێبەجێکردنی هەموو هەنگاوو بابەتە ئەوروپیەکان و بەرنامەکانی ڕاهێنان بێگوێدان بە داب و نەریتی ولاتە ئیسلامیەکان و نەگونجانی لە گەڵ بەهاکاندا.

## کارگێڕی ئەکادیمی

دەستەیەکی کارگێڕی و بەڕێوەبردنی بۆ خۆی لە چوارچێوەی بەرنامەیەکدا داڕشتوە:

١. ئیعتمادکردنی سەنتەرەکانی ڕاهێنان و بەخشینی مافی ئەندامێتی و توانای خۆهەڵبژاردن پاش بەدەستهێنانی سێ پلەی ئەندامێتی لە دوای یەکتر.

٢.دەستەی بەڕێوەبردنی ئەکادیمیاکە لە ئەندامە هەشتبەکان «دامەزرێنەرەکان» پێکدێت, لەو ئەندامانەی هەڵبژێردراون لە سەنتەرەکان

٣.دەستەی کارگێڕی بەڕێوەبەری گشتی ئەکادیمیاکە بۆ ماوەی ﴿٣ بۆ ٥﴾ ساڵ هەڵدەبژێرن.

٤.سەرۆکی ئەکادیمیا پاش هەڵبژاردنی بە بەڕێوەبەری جێبەجێکردن، هەڵدەستێت بە دامەزراندنی دەستەیەك بۆ یارمەتیدان و هاوکاری کردنی لە جێبەجێکردن و بەڕێوەبردنی ئەرك و کارەکانی .

## تێگەیشتن لە ڕاهێنان

ئەمڕۆ بابەتی ڕاهێنان بە یەکێك لە بابەتە سەرەکیەکان دادەنرێت کە گرنگیەکی تایبەتی پێدراوە, لەو کاتەوەی مرۆڤ لە سەر زەوی دروستبوە بەکاری هێناوە بۆ گواستنەوەی زانیاریەکان و شارەزاییەکانی دەربارەی ژیان لە کەسێکەوە بۆ کەسانێکی تر, بەلاّم ڕاهێنان بە واتا نوێیەکەی دەگەڕێتەوە بۆ کەمتر لە سەد ساڵ لە مەوبەر.

لە سەرەتای سەدەی بیست و یەك و پێشکەوتنەکانی بواری تەکنەلۆژیاو فراوان بونی بوارە جیاجیاکان بۆ کارکردن و پێویستی تاکەکان بۆ زۆرکردنی تواناو شارەزاییان لەو بوارانەدا بەتایبەتی لە بوارەکانی تەکنەلۆژیاو کارگێڕی و سەربازی و وەرزشی ئەمەش بۆ ئەوەی کە ژمارەی کارمەندەکان زۆربن لە ڕوی چۆنیەتی و چەندێتیەوە .

ئەم کارەش پێویستی بە ئامادەسازی و ڕاهێنان هەیە بۆ دابینکردنی بەهرەداران و لە بەر ئەوەی ئەم سەردەمەش بەسەردەمی خێرایی ناسراوە کاتی نەماوە بۆ فێربون لە ڕێگەی شارەزایی و هەلەکان چونکە ئەوە ڕێگەیەکە کاتێکی زۆرمان لێ بە فیڕۆدەدات.

ئێستا ئێمە پێویستمان بە وەبەرهێنان و پاشەکەوتکردن هەیە لە کات و تواناو سامانیشدا, لە پێناو گەیشتن بۆ فێربون و شارەزابون لە ئەزمونەکان و فراوانکردنی زانیاریەکان لە سەر ئاستی تاك و

دامەزراوەکان و حکومەتەکان بە مەبەستی جوڵەیەکی خێراو ململانێ لە سەر بەدەستهێنانی دەستکەوتێکی زۆرتر.

دەتوانین ڕاهێنان پێناسە بکەین بەوەی کە:

- کردارێکی تایبەتی فێرکردنە ڕێنمایی کراوە بە نامانجی بەدەست هێنانی شارەزاییەکی دیاری کراو لە لایەن ڕاهینەرەوە.

ڕاهێنان:- بریتیە لە کرداری بەدەستهێنانی شارەزایی و پاشان پوختەکردنی ئەو شارەزاییە بۆ گەیشتن بەئاستی چاکترین بۆ هەمان ڕۆڵ، هەمان شت دوبارە دەکرێتەوە بەڵام لە هەمو دوبارە کردنەوەیەکدا گۆڕانکاری نوێ زیاد دەبێت.

ڕاهێنان لە ڕاستیدا تەنها بە بەدەستهێنانی زانیاری نابێت بەڵکو دەبێت لێهاتویی هاوشانی بێت لە ڕاهێنان لە سەر بەهرەکان و پێشبڕکێی تواناکان.

پێناسەیەکی تریش بۆ ڕاهێنان هەیە بریتیە لە :

- دەوڵەمەندکردنی تاکەکانە بە هەمو ئەو زانیاری و شارەزایانەی ڕاهێنەر خاوەنێتی لەو بوارەی خۆیدا بە شێوەیەکی تیۆری و کرداری بەپێی نەخشەیەکی دیاریکراو پێشکەشی بەشداربوانی دەکات بۆ ئەوەی کە توانایەکی باشیان پێببەخشێت و کارەکەی خۆشی بەسەرکەوتویی ئەنجام بدات.

لەسەر بناغەی ئەو دو پێناسەیە بێت ڕاهێنان خۆی گرتوە لە چەند سەرچاوەیەکی دیاریکراوی کورت کراوە لە زانیاریەکان بە مەبەستی دەوڵەمەندکردنی بەشداربوانی خولی ڕاهێنەران بە زۆرترین زانیاری.

ئـەم ئاسـتەش بـە ئاسـتی زیـادکردنی زانیارییـەکان و ناسـاندنیان دەناسـرێت بـەڵام ئاسـتی دواتـر دەگوازرێتـەوە بـۆ بەدەسـت هێنانی بـەهرەکان لەسـەر ئـەو زانیاریانـەی کـە لـە ڕاهێنەرەکانـەوە بەدەست هێنراون.

بەواتایەکی تر هەنگاونانە لە ئاستی گواستنەوەی زانیاریەکان بۆ ئاستی کرداری.

ئەمـە بـە تـەنها بـەس نیـە بـەڵکو ڕاهێنـەر پێویسـتی بـە شارەزاییەکی تەواو هەیە لە جێبـەجێ کردنـی ئـەو کارامەیـە, ئەمـەش بـە (پێشبڕکێی تواناکان) ناودەبرێت چونکە کارامەیی بەبێ شـارەزایی تـەواو سودی نیە بـەڵکو دەبێـت بەدەسـتهێنانی کارامەیـەکان بـە باشـترین شـێوە بێت بۆ ئەوەی خاوەنەکەی توانـای ململانـێ و پێشـبڕکێی لەگـەڵ بەرامبـەرەکانی هەبێت.

## بیردۆزەکانی فێرکردنی گەورەکان

لەو کاتەوەی گرنگی بـە لێکۆڵینـەوەکان لەسـەر هـەڵس و کەوتەکانی مرۆڤ دراوە گرنگیەکی زۆریـش بـە شـێوازەکانی خوێنـدن و فێربونـەکانی دراوە هەتا لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا ئەم بابەتە گەشتە لوتکە. ڕێکەوتنێکی گەورەش هەیە لە نێوان لێکۆڵەرەوەکان لەسـەر ئـەم بوارە واتە بواری گرنگیدان بە فێربون و ڕۆڵی لە ژیاندا.

ئەگەر ڕێکەوتنێکی گەورە هەبێت لەسەر پێناسەکردنی فێرکردن بەوەی کە (جۆرێکە لە چاکسازی هەڵس و کەوتەکانی مرۆڤ) ئەوا تێگەیشتن لە فێربون و دیاریکردنی گۆڕانکاریە گرنگەکان کە لە هەڵسوکەوتی مرۆڤدا لە ئەنجامی ئەو فێربونە ڕودەدات دەرکەوتنی بیردۆزەکانی فێرکردن وەك (پەیوەندییەکان.. مەرجەکان.. پاڵنەرەکان... لێکۆڵینەوە.,, چارەسەرکردنی زانیارییەکان... هتد ) هیچ نین تەنها ئەوە نەبێت کە بەڵگەن لەسەر زۆربونی ڕێگاکانی لێکۆڵینەوە لەسەر فێربون.

تەنها خاڵی هاوبەش لە نێوان هەمو ئەو بیردۆزانەدا ئەوەیە کە هەمویان دەگەڕێن بەدوای کردارێك خۆی کۆبکاتەوە لە چەند زنجیرەیەك لەو بنەمایانەی کە سەرچاوەبێت بۆ مرۆڤەکان بۆ خۆ فێرکردن.

## *پۆلێن کردنی بلوم بۆ تەوەرەکانی فێرکردن*

بنجامین بلوم .. یەکێك بو لە مامۆستاکانی بەشی دەرونناسی پەروەردەیی لە زانکۆی شیکاغو لە ساڵی ١٩٥٦ هەستا بە ئاشکراکردنی (پۆلێنکردن بۆ ئامانجەکانی فێرکردن) کە بە بەردی بناغە دادەنرێت بۆ ژینگەکانی پەروەردەو فێرکردن.

## بلوم ئامانجەکانی فێرکردن پۆلێن دەکات بۆ سێ جۆر :

**یەکەم: بازنەی هەڵسوکەوتەکان (نطاق السلوكيات) :** کارامەیی لە بازنەکانی کاریگەری و هەڵسوکەوتەکان دەگرێتەوە, هەروەها شێوازی

کارکردنی تاکەکان لە باری سۆزداریەوەو توانای ئەو تاکانە بۆ لێهاتوی

لە بواری هەڵسوکەوتدا (سۆزداری و هەستیاری).

دووەم: باری جوڵەی جەستەیی: ئەم بارە پەیوەستە بە توانای

کۆنترۆڵکردنی ئەندامەکانی جەستە وەك (دەستەکان.. هەردوقاچ.. هتد)

ئامانجەکانیش لەم بارە بۆ ئەوەیە کە بتوانیت کۆنترۆڵی جوڵەکانی

جەستەت بکەیت لە کاتی قسەکردندا.

سێیەم: باری هەستکردن یان بیرکردنەوە: ئەم بارەش پەیوەن

هەیە بە زانیاریەکان و تێگەیشتن و هەستکردن و بیرکردنەوە و تێڕوانین لە

بابەتێکی دیاریکراو.

بارەکانی ناسراوەکان لە لایەن (بلوم)ەوە دابەشدەکرێت بۆ شەش ئاست بۆ

ئەوەی فێرخوازو ڕاهێنەرانیش بگەیەنێتە ئاستێکی باش.

ئاستەکانیش بەم شێوەیەن:

- زانین (بریتیە لە بانگکردنی زانیاریەکان بۆ مێشك (بیر).
- تێگەیشتن: بریتیە لە هەستکردن و وەرگرتنی زانیاریەکان.
- شیکردنەوە: شیکردنەوەو بەش بەش کردنی زانیارییەکان بۆ سەرچاوەکان.
- پێك هێنان: کۆکردنەوەی بەشەکانە بۆ بونیادنانی شتێکی نوێ.
- هەڵسەنگاندن: دەرکردنی بڕیارە لەسەر بابەتەکان بەپێی بنچینەکان.

بە گوێرەی ئەو ئاستانە بێت: ڕاهێنان سێ کاری بنەڕەتی هەیە کە بریتین لە:

١. گواستنەوەی زانست و زانیارییەکان.
٢. ڕاهێنان لەسەر کارامەییەکان و پوختەی تواناکان.

٣. ڕاستکردنەوە یان گۆڕینی بۆچونەکان و بیرکردنەوەکان و پاشان ڕێکخستنی هەڵسوکەوتەکان ئەوەش بە ئامانجی بەرزکردنەوەی بەرهەم و شارەزایەکان لەسەر ئاستی تاك و دەزگاکان .

## *شەش دانانەکەی (مالکولم) بۆ فێرکردنی گەورەکان*

ڕێگاکانی وانەوتنەوە لە کۆندا بە شێوەی ڕێنمایکردن بوە، واتە مامۆستاکە وەك سەرکردەیەك لە پۆلدا ڕاوەستاوەو دەستی بە وانە وتنەوە کردوەو خوێندکارەکانیش گوێیان بۆ گرتوە ئەو جۆرە خوێندنە بە(فێرکردنی منالەکان) ناسرابو.

لێرەوە دەستەواژەی (فێرکردنی گەورەکان) لە ساڵی ١٩٧٣ دا بۆ یەکەم لەسەر دەستی (مالکولم نیلز) هاتە ئاراوە لەوکاتەوە لە ڕێگەی پەرتوکەکانیەوە دەستەواژەی (فێرکارە گەورەکە) گواسترایەوە بۆ ناو خەڵکی بەبێ جیاوازی لە نێوان جۆرو ڕەگەزە پشتگوێ خراوەکان, لەو ساتەوە کرداری فێرکردنی گەورەکان لە تیۆریەوە گواسترایەوە بۆ کرداری.

١- ***تێگەیشتن لە خود:*** ئاماژەیە بۆ وەرچەرخان و ڕوکردنی گەورەکان بۆ پەروەردەکردن و فێرکردنی خۆیان هاوکات لە گەڵ گەشەکردنی تەمەنیان و بیرکردنەوەکانیان چونکە گەورەکان هەمیشە حەزدەکەن خودی خۆیان شتەکان هەڵبژێرن کەی دەیانەوێت فێری ببن و باشترین کاتەکان بۆ فێربون و ڕێگاکانی چۆنیەتی فێربون.

ئەم بیردۆزەش ئەوە دەگەیەنێت کە ئەرکی سەرشانی ڕاهێنەرەکە یان مامۆستاکەیە بواری هەڵبژاردن زیاتر دابین بکات بۆ فێرخوازە

گەورەکان و ڕێگەیان پێبدات کە خۆیان نەخشەی تاقیکردنەوەکانیان بکێشن و ژینگەیەك دابین بکەن پڕبێت لە هاوکاری و ڕێزی هەردولا.

٢ - شارەزایی: فێرخوازە گەورەکان خاوەنی گەنجینەیەکی گەورەن پڕە لە شارەزایی بۆ ژیان ئەمەش هۆکارێکی زۆرباشە بۆ فێربونی شتە نوێیەکان چونکە بەهۆی ئەو شارەزاییەوە کە هەیانە دەتوانن بەشداریکردنێکی دەوڵەمەندیان هەبێت لە گفتوگۆکاندا و سودێکی زۆر بە یەکتری بگەیەنن، سەرەڕای ئەوەش لەوانەیە هەندێك فێرخواز سیفەتی لایەنگرێتی تێدا بەدی بکرێت بۆیە دەبێت مامۆستا یان ڕاهێنەرەکە ئاگاداری ئەوە بێت و نەهێڵێت ئەو شارەزاییە ڕێگربێت لە بەردەم فێربونیان بۆ شتە نوێیەکان.

٣ - ئامادەبون بۆ فێربون پشتدەبەستێت بە پێویستی بۆ فێربون:

ئامادەبون بۆ فێربون لای گەورەکان پشتدەبەستێت بە ئاستی پێویستی فێربونی ئەو کەسە بەو زانستە لە ژیانی کرداریدا، ئەو هەڵوێستانەی ژیان کە گەورەکان ملکەچ دەکەن هەوڵی فێربون بدەن کۆمەڵێك شت دەگرێتەوە لەوانە:

فێربونی چۆنیەتی پەروەردەکردنی منداڵە خاوەن پێداویستیە تایبەتیەکان یان فێربونی شێوازی لێنانی ئەو خواردنانەی کە تەندروستین بۆ پارێزگاریکردن لە تەندروستی خۆی.

٤- سەرنج خستنەسەر چارەسەری کێشەکان: گەورەکان پێویستیان بە بەدەستهێنانی ڕێگایەکی پەلە هەیە بۆ فێربون بۆیە ئەوان کۆشش دەکەن بۆ هەلەکانی فێربون لەو بوارەی کە بەهێزیان دەکات بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان.

٥ - پاڵنەرە ناوەکیەکان (الدافع الداخلي): گەورەکان بەدوای هەلی فێربوندا دەگەڕێن لە هاندەرە دەرەکیەکانەوە(محفزات) بەڵام هاندەرە ناوەکیەکانی وەك (ڕێزگرتنی خودو چاکردنی بواری دارایی و بەدەستهێنانی خودی کەسایەتی و... هتد) بەهێزتر دەمێنەوە.

٦ - گەورەکان پێویستیان بەوەیە بزانن بۆچی ئەوان پێویستیان بەزانینی شتەکان هەیە: گەورەکان پێویستیان بەزانینی ئەو سودە هەیە کە لە ڕێگەی ڕاهێنانەوە دەستیان دەکەوێت و چۆن ئەو فێربونەش لە پێناوی هێنانە دی بەرژەوەندیەکانیاندا بەکاردەهێنن.

## بازنەی ڕاهێنان

ڕێکخستنی کردنەوەی خولێکی ڕاهێنان پێویستی بە چەند هەنگاوێکی جیاجیا لە ئیشکردن و کارامەیدا هەیە لەگەڵ بونی ڕێکوپێکیەکی زۆر لە کاتی نەخشەداناندا و پاشان ڕێکخستنی پەیوەندیەکان لە کاتی پێشنیارکردن بۆ دەستپێکردنی خولەکە, پاشان خولەکە دەستپێدەکات و بەردەوام دەبێت تاکو پێشکەشکردنی ڕاهێنانەکەو ڕۆشتنەوەی بەشداربوان .

ئەم ئاستانە بە (پێنج پیتی تایەکان ) ناودەبرێت واتە ئەو کارانەی کە بەپیتی (ت) دەستپێدەکەن کە بریتین لە (التحلیل – لێکۆڵینەوە – التهدیف – نیشانشکاندن – التصمیم – نەخشەکێشان – التنفیذ – جێبەجێکردن – التقیم – هەڵسەنگاندن).




یەکەم: شیکردنەوەی پێویستیەکان: یەکەم هەنگاو بۆ دامەزراندنی خولێکی ڕاهێنان دیاریکردنی پێداویستیەکانی بەشداربوانی خولەکە، ڕێگای جیاواز هەیە بۆ چۆنیەتی دیاریکردنی پێداویستیەکان، دەتوانیت لێکۆڵینەوەیەکی چڕوپڕ بکەیت بۆ ئەوکەسانەی کە حەز

بە بەشداریکردن هەیەو زانیاری تەواوت لابێت سەبارەت بە ژمارەی بەشداربوان و ئەو پرۆگرامەی کە سەرنجی دەخرێتە سەر لە خولەکەداو دانانی نەخشەیەکی چرو پڕ.

شیکردنەوەکە ئاستی جێبەجێکردنی ڕێکخراوەکە یان دەزگاکە یان کەسەکە بۆ کارەکانی دیاریدەکات و دەگەڕێت بە دوای هۆکاری کەمتەرخەمیەکەو پاشان ڕاهێنانەکە دەستپێدەکات بە هەمو ئەو توانایانەی خوازراوە بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشای و کەمتەرخەمیانەی هەیەو بەرزکردنەوەی ئاستی ڕێکخراوەکە یان دەزگاکە یان کەسەکە بۆ ئەو ئاستەی خۆمان دەمانەوێت و پێشبینی لێدەکەین.

**دووەم: دانانی ئامانجەکانی ڕاهێنانەکە:** بریتیە لە ڕەچاوکردنی ئاستەکانی ڕاهێنان و مەبەستەکان لێی و هەوڵی بەدیهێنانی کە بریتین لە کۆمەڵە ئامانجێك نەخشە بۆ بەدیهێنانیان دادەنرێت و پەسەند دەکرێت پێش دەستپێکردنی خولەکە.

ئەگەر توانیمان ئامانج لە ڕاهێنانەکە دیاری بکەین واتە هەنگاوێکی گرنگ نراوە کە دەمان بات بەرەو تێگەیشتن لەو شێوازو پێداویستیانەی دەمان گەیەنێتە ئەو ئاراستەیەی دەمانەوێت.

**سێیەم: نەخشەکێشانی پرۆگرامەکە:** نەخشە دادەنرێت بۆ پرۆگرامەکە بە مەبەستی بەدیهێنانی ئەو ئاراستانەی لە شیکردنەوەی پێداویستیەکان دانراون بۆیە دەبێت نەخشەکە بە ڕێگایەك بێت کات و

ماندوبونمان بۆ بگێڕێتەوە لە لایەکەوەو لە لایەکی تریشەوە توانی
جێبەجێکردنی بەشداربوان زیاد بکات .

بۆ ئاسانکردنی ئەم کارانەو سەرکەوتنی خولەکە وا پێویست دەکا
هەمو پێداویستیە پێشکەوتوەکان لە ڕوی ئامێرو توانایسەوە
بەکاربهێنرێت و ڕەچاوی ئەم خاڵانە بکرێت:

١- هەڵبژادنی ناونیشانی ﴿سەرەکی و لقەکان و بەشەکان﴾ بەشێوەیەک
بێت گونجاوبێت لەگەڵ ئامانجەکان .

٢- دیاریکردنی ﴿ئامرازو پێداویستیەکان ﴾ و توێژینەوە لە کاریگەری
یان چۆنیەتی گەیاندنی بابەتەکەبە فێرخواز ﴿مەشق پێکراو﴾.

٣- دیاریکردنی کات بۆ هەمو بابەتێك لە گەڵ کاتەکانی پشودان.

٤- هەڵبژاردنی جۆرەکانی ناساندن و کارامەیی و هەڵسوکەوتە
داواکراوەکان بەشێوەیەك تەواوکەری یەکتربن.

٥- جۆرو بارستایی بەشداریکردنی فێرخوازان﴿مەشق پێکراوەکان﴾ لە
چالاکیەکاندا.

٦- ڕۆڵی ڕاهێنەر بە شێوەیەکی گشتی یان تایبەتی لە دەستخستنە نا
بڕگەکان لە کاتی ڕاهێناندا.

٧- قوڵی و بارستایی مەشقکردن بۆ هەمو بڕگەکان بە وانە
دابەشکردنی بڕگەکان بۆ گرنگ و گرنگترین یان بنەڕەتی و لقەکان
﴿اساسیات و فرعیات﴾ و بەخشینی کات و ئەرکەکان بەپێی گرنگی
ڕۆڵەکان.

سەرەڕای ئەو شتانەش پێویستە ئەو یەکانە هەمویان بەیەکەوە گونجاوبن و باشتریش وایە بەرنامەکە لەسەر پڕۆگرامێکی دیاریکراو نەخشەی بۆ دا بڕێژرێت کە پێشتر ناسراو بێت و تاقیکرا بێتەوە لە بواری ڕاهێناندا و لە لایەن ڕێکخراوێکی ڕاهێنانی ناسراوەوە لە جیهانی ڕاهێناندا متمانەی پێکرا بێت.

## چوارەم: جێبەجێکردنی پڕۆگرامەکە:

قۆناغی جێبەجێکردن پشتدەبەستێت بە ڕۆڵی ڕاهێنەرو کارامەیی لە گۆڕینی پڕۆگرامەکە لە قۆناغی نەخشەو نوسراوەوە بۆ قۆناغی کرداری بەشێوەیەك بەشداربوان سودی لێوەربگرن.

هاوکات ڕاهێنەر پێویستی بە کارامەیەکی بەرز هەیە لە تواناکانیدا بیخاتە گەڕ لە کاتی هەڵسوکەوت کردنی لەگەڵ بەشداربوان.

هەندێك کات وا پێویست دەکات ڕاهێنەر گۆڕانکاری لە هەندێك برگەکانی بەرنامەکاندا بکات بەپێی جۆرو شوێنی کەسەکان و بەشداربوان بە تایبەت ئەگەر بەرنامەکە لە سەر بنەمای نزیکەیی﴿افتراضي﴾ نەخشەی بۆ کرابێت.

لەو دۆخەدا پێویستە ڕاهێنەر هەستێت بەدەستکاریکردن و چاکردنی ڕۆڵەکانی خۆیی و سروشتی چالاکیەکان سەبارەت بە ڕاهێنەرەکان بە مەرجێك گۆڕانکاریەکان بە شێوەیەکی وا زۆر نەبن کاریگەری بکاتە سەر ناوەڕۆکی گشتی خولەکە.

ئەگەر نا ئەوا دەبێت جارێکی تر نەخشەیەکی نوێ دابنرێتەوە لەسەر

بناغەی ڕاهێنەرەکان پێی.

## پێنجەم: هەڵسەنگاندنی بەرنامەکە [پرۆگرامەکە]:

کرداری هەڵسەنگاندنی پرۆگرامەکە بە جێبەجێکردنی پرۆگرامەکە

دەستپێدەکات و بەکۆتایی هاتنیشی کۆتایی دێت.

سەرەڕای چەند کردارێکی تر کە درێژدەبێتەوە بۆ دوای تەواوبوونی

خولەکە بە ئامانجی دەستخستنی زانیاریەکان لە سەرکار کاریگەری

خولەکە بۆ ڕۆڵی بەشداربوان و بەدەستهێنانی ئامانجەکان و

جێبەجێکردنی برگەکانی پرۆگرامەکە بەپێی ئەو نەخشەیەی بۆی

دانراوە.

لە ئاکامی ئەو شتانەی لە ڕابردودا باسمان لێکردون دەرکەوت ئامانج

لە کرداری هەڵسەنگاندنی پرۆگرامەکانی

ڕاهێنان بریتیە لە :

١- زانینی ئەو کەموکورتیانەی لە کاتی جێبەجێکردنی پرۆگرامەکان

ڕویداوە لە ڕوی پلان و ئامادەکاریەوەو جێبەجێکردنی و وەستان لەسەر

هۆکارەکانی بۆ ئەوەی لە خولێکی داهاتودا ئەو هەڵەو کەموکورتیانە

دوبارە نەبنەوە.

٢- دیاریکردن و زانینی ئاستی سەرکەوتنی ڕاهێنەرەکان لە کاتێکدا

هەڵدەستن بە کرداری ڕاهێنان و گواستنەوەی بابەتی ڕاهێنانەکان بۆ

فێرخوازان.

٣. نیشاندانی وێنەیەکی ڕون لە سەر ئاستی سود بەخشینی فێرخوازەکان لە ڕاهێنانەکان.

٤. دەبێت خاڵە بەهێزو لاوازەکانی خولەکە زۆر بە وردی لە کاتی هەڵسەنگاندندا ئاماژەی پێبکرێت لەگەڵ زانینی ئاستی ڕازیبونی بەشداربوان لە گونجاندنی بابەتەکان لەگەڵ تواناکانیان .

گرنگتر لەوانەش پێوانەکردنی (قیاس) بەرزبونی ڕۆڵی بەشداربوان و ڕێژەی سود وەرگرتنیانە لە پرۆگرامەکە.

## دانانی ئامانجەکانی ڕاهێنان ( وضع الاهداف التدريبية )

ئامانجەکان پێکهاتەی سەرەکی خولەکانی ڕاهێنانن لەسەر ئەو ئامانجانەش بابەت و پێداویستی و ستراتیژی خولەکان دادەڕێژرێن.

بۆ کارئاسانی چۆنیەتی ئەو پێکهاتانە جۆرێك لەو ئامانجانە دەخەینە بەردەستتان کە لەدوای ئەوەوە بە شێوەیەکی لێهاتویی (احترافي) پێکهاتەی خولەکە دادەڕێژرێت:

**یەکەم: ئامانجی گشتی:** ئامانجە گشتییەکان بە پلەی خاڵی کۆتایی دادەنرێت کە ئێمە دەمانەوێت بگەین پێی لە کۆتایی خولەکەدا چونکە ئامانجە گشتیەکە پەلدەهاوێت بۆ چەند لقێکی جیاجیا.

ئەگەر خولەکە پێکهاتبو لە چەند ڕۆژێك ئەوا ئامانجەکانیش دابەشدەبن بەپێی ژمارەی ڕۆژەکان بە واتای ئەوەی هەر ڕۆژێك و ئامانجێکی دیاریکراوت دەبێت.

بـۆ ئـەوەی بەشـداربو بزانێـت هـەمو ڕۆژێـك ئامـانجێکی نـوێ بەدیـدەهێنێت ئـەم جـۆرە شـێوازە هانیـدەدات کـە بـەردەوام بێت لە خولەکەو هەستبکات ڕۆژانە فێری شتی نوێ دەبێت.




## دووەم: ئامانجە لقیەکان (الاهداف الفرعیه):

**[ئامانجی ڕاهێنانی ڕۆژانە... ئامانجی یەکەی ڕاهێنان]**

ڕاهێنانی ڕۆژانە پێکدێت لە چەند ژمارەیەك لە یەکەکانی ڕاهێنان کاتێکی پشودان لە نێوانیاندا بۆ ماوەی ﴿١٥ بۆ ٣٠﴾ خولەکە .

باشتر وایە هەریەکێك لە یەکەکانی ڕاهێنان ئامانجێکی دیاری کراوی خۆی هەبێت. ئامانجیش لەمە ئەوەیە فێرخواز هەست بکات لە هەمو یەکەیەك سود وەردەگرێت تا کۆتایی خولەکە. بۆ ئەوەی کاتێك

دەردەچێت لە خولە کە هەستبکات سودێکی باشی پێگەیشتووەو پێوەی دیاربێت.




**سێیەم: ئامانجە ڕاپەڕێنراوەکان (الاهداف الاجرائیه):**

هەمو یەکەیەکی ڕاهێنان لە «٤٠ بۆ ٩٠» خولەك پێکدێت، لەو ماوەیەدا پێویستە بەلایەنی کەمەوە سێ ئامانجی ڕاپەڕێنراوی زانیاری کارایی هەڵسوکەوتی«A-S-K» لە خۆی بگرێت.

ئەگەر زانیاریەك ببەخشین سەبارەت بە یەکێك لە شێوازەکانی ڕاهێنانی وەك «کۆمەڵەکانی بیرکردنەوە» :

١- ئامانجە ڕاپەڕێنراوەکە [الهدف الاجرائی]: پیتی «K» بریتیە لە بەخشینی زانیاری بە بەشداربووان لە ماوەی «٥ بۆ ١٠» خولەک دەربارەی ئەو شێوازە.

٢- ئامانجە ڕاپەڕێنراوەکە: پیتی «A» بریتیە لە چالاکی بۆ ئەوەی بەشداربوان قەناعەت بکەن ئەو شێوازە زۆر کاریگەرو کارایە لە ڕێگەی گفتوگۆکردنی شێوازەکەو باسکردنی تایبەتمەندیەکانی.

٣- ئامانجی ڕاپەڕێنراو: پیتی «S» بریتیە لە جێبەجێکردنی ئەوشتانەی تیۆری بون بۆ ئەوەی زانیاریەکان لە شێوەی تیۆریەوە بگۆڕن بۆ کرداری و شارەزابون.

لە ڕێگەی ئەم خشتەیەوە شارەزای گرنگترین شێوازەکانی ڕاهێنان دەبین پاشان ئامانجە ڕاپەڕێنراوەکان بە وردی دیاری دەکەین.

| کردارەکان – بلوم | زانیاری | کارامەیی | قەناعەت |
|---|---|---|---|
| زیادکردن | ١ | ٤ | ٧ |
| بەدەستهێنان | ٢ | ٥ | ٨ |
| ڕێکردنەوە | ٣ | ٦ | ٩ |

دوای شیکردنەوەکان بۆمان دەردەکەوێت بۆشاییەك بونی هەیە پێویستی بە ڕاهێنان هەیە بەڵام چ جۆرە ڕاهێنانێك؟ کام ئاستەیان؟

بۆ ئەم کارە پێویستە بە وردی سێ چوارگۆشە دیاری بکەین بۆ هەریەکێك لە خولەکانی ڕاهێنان لە ﴿٩﴾ بنچینە بەواتای ئەوەی یەکێك هەڵبژێرین لە ﴿زانیارییەکان﴾ و یەکێکیش لە ﴿کارامەییەکان﴾ یەکێکی تریش لە ﴿قەناعەتەکان﴾ بۆ ئەوەی کرداری ڕاهێنانەکە تەواو بێت.

تێبینی :

زیادکردن [پاشەکەوت]: بە واتای ئەوەی فێرخوازەکان پێش ئەوەی بەشداری خولەکە بکەن لە وانەیە خۆشیان خاوەنی زانیاری یان کارامەیی یان قەناعەت کردن بن بۆیە ئەمە تەنها بەس نیە بەڵکو پێویستیان بە زیادکردنی زۆرتر هەیە لەو شتانە.

بەدەستهێنان : بەواتای ئەوەی فێرخوازان خاوەنی هیچ زانیاری و کارامەیی و قەناعەتکردن نین ئەو کاتە پێویست دەکات لە سفرەوە لەگەڵیان دەستپێبکەیت.

ڕێککردنەوە [چاکردن]: بەواتای ئەوەی فێرخوازان خاوەنی زانیاری و کارامەی و قەناعەتکردن بەلاّم هەڵەیان تیادایەو پێویست بە ڕاستکردنەوە دەکەن.

## سەرەتا و کۆتایەکاریگەرەکان

ساتەکانی یەکەمی چونەژورەوەی ڕاهێنەر بۆلای فێرخوازان بە شێوەیەکی کاریگەرو بەهێز بۆ دەستپێکردنی خولەکە یەکێکە لە بناغە

سەرەکیەکانی سەرکەوتنی خولەکە بەتەواوی چونکە بەشداربوان لە ساتی یەکەمەوە شارەزایی وەردەگرن لە هەڵسوکەوت و خوی ڕاهێنەر.

گۆڕینی ئەو بۆچونەش لای فێرخوازان زۆر ئەرکێکی گرانە چونکە لە سەرەتای خولەکەوە فێرخواز سروشتێکی وشك و ناوازە لە هەستی هەیە بەرامبەر بە شوێن و بابەت و ڕاهێنەرەکەش.

لێرەدا ڕۆڵ و کارامەیی و توانای ڕاهێنەر دەردەکەوێت لە گۆڕینی ئەو هەستە نامۆیەی فێرخواز هەیەتی بەرامبەر بە بابەتەکانی خولەکە و شوێن و ڕاهێنەرەکە بۆ هەستێکی ئەرێنی و دروستکردنی پەیوەندییەکی خۆشەویستی لە نێوان ڕاهێنەرو فێرخوازدا بۆ ئەوەی هەستبکات لە نێوان کەسوکارو خێزانی خۆیدایە.

سەبارەت بە کۆتایی کاریگەریش ئامانج لێی ئەوەیە کە هێزو کاریگەری بابەتەکانی خولەکە بۆ ماوەیەکی درێژ لەبیردا بمێنێتەوە چونکە نەریتی مرۆڤەکان وا هەڵکەوتوە هەمیشە کاتە کۆتایەکانی چالاکیەکان یان کارەکان و خولەکان دێتەوە بیریان و هەڵسەنگاندنی لەسەر دەکەن.

## سودەکانی سەرەتای کاریگەر:

١- ئاسانکردنی ناساندن لە نێوان ڕاهێنەرو بەشداربوان لە لایەك و لە نێوان بەشداربوا نیش لەگەڵ یەکتری لە لایەکی ترەوە.

٢- وروژاندنی لایەنی سۆزداری بەشداربوان بۆ ئەوەی بەتەواوی پەیوەندییان لەگەڵ جیهانی دەرەوە بپچڕێت و لەگەڵ ژینگەی فێرکردنەکەدا بگونجێن.

٣- ڕەخساندنی کەشێکی ئەرێنی و سروشتی پڕ لە برایەتی و هاوکاری لە نێوان بەشداربوان بۆ کارکردن و بەهێزکردنی پەیوەندیەکان.

٤- ڕێگەخۆشکەری بۆ دروستکردنی ڕۆحی هاوکاری لە نێوان تیمەکان لە کاتی کارکردندا.

٥- ڕێگەخۆشکەریەکی کاریگەر بۆ چونە ناو بابەتە قورسەکانەوە.

٦- شارەزابونی ڕاهێنەر بۆ هەندێك لەو شتانەی کە بەشداربوان بایەخی پێدەدەن.

٧- یارمەتیدانی بەشداربوان بۆ بیرکردنەوە لە دەرەوەی بازنەی خولەکە.

٨- هەستکردن بە هێمنی و ئارامی دەرون لە گۆڕەپانی ڕاهێنان ئەمەش یارمەتی دەرێکی خێرایە بۆ فێرخواز کە زو فێری شتەکان ببێت.

٩- شکاندنی هەستی نامۆیی لە نێوان بەشداربوان و ڕاهێنەر بەشێوەیەکی زۆر سادەیی و هەستکردن بەوەی کە ڕاهێنەر یەکێکە لە ئەوان.

١٠- زاڵبون بەسەر ماندوێتیدا بەتایبەتی ئەگەر فێرخوازەکان لە ئەنجامدانی کارێکی درێژی ئەو ڕۆژەوە ئامادەی گۆڕەپان بوبن.

**سیفاتەکانی شکاندنی هەستی نامۆیی ﴿مواصفات كواسر الجمود﴾:**

١- دەبێت زیاتر گفتوگۆ لەگەڵ لایەنە هەستیەکە بکرێت لە چاو لایەنە زانیاریەکە.

٢- شکاندنی ئەو هەستە نامۆیە پێویستە هەندێك جوڵەی جەستەیی لەگەڵدا بێت.

٣- پێویستە شێوازێکی هونەری نایابی پێوە دیاربێت.

٤- لە لایەن کاتەوە پێویستە کورت بێت.

٥- بەسود بێت بۆ هەمو تەمەن و زانیاریە جیاوازەکان.

## کۆتاییەکاریگەرەکان:

چەند بۆچونێکی جیاجیا هەیە بۆ دیاریکردنی ڕێڕەوی برگەکا
ڕوی قورسی و کاریگەرێتی و خۆشیەکانەوە بۆیە باشتر وایە ڕاهێنەر
برگەکانی کۆتایی چالاکیەکی بەهێزو کاریگەر هەڵبژێرێت لێ
ڕەچاوکردنی ئاسانی جێبەجێکردنی بۆ ئەوەی بەهێزی خولەک
بیریاندا بمێنێتەوەو لە نێوان خۆشی و کاریگەریەکاندا پەیوەندیی
بەهێز دروست بکات و ڕێگە خۆشبکات بۆ کورتکردنەوەی ناوبڕی
خولەکەو بەدەستەوەدانی ئامانجەکە لێی.

# پێشەکی

ئاستی دیاریکردنی پێداویستیەکانی ڕاهێنان بەو بناغەیە دادەنرێت کە هەمو بەشەکانی تری کرداری ڕاهێنانی لەسەر بونیاد دەنرێت.

لەم قۆناغەدا پێویستە سەرنج بخرێتە سەر ئەو زانیاریانەی پەیوەندیان بە بابەتەکەوە هەیە چونکە کردارەکانی ڕاهێنان ﴿ATTRIBUTES-ORIENTED﴾ بەو خاسیەتانەی تایبەتە بە تاکێکی ڕێکوپێکەوە کردار لەگەڵ ئەو تاکە دەکات وەك ئامێرێکی گۆڕین بۆیە پێویستە زانیاریەکان بەپێی ئەو خاسیەتانە بێت کە تایبەتە بەو تاکەوەو دەگونجێت لەگەڵیدا چونکە ئەو هۆکارانە ڕێگری دەکەن لە بەردەم نمایشکردنی تاکەکە بۆ ئەو کارەی لە ئێستادا یان لە داهاتودا ئەنجامی دەدات.

ئەنجامدانی کارەکان بە شێوەیەکی ڕێکوپێك دەبێتە هۆی دەستەبەرداركردنی بەڕێوەچونی خولێکی ڕاهێنانی بەبەرنامە پڕ لە ئامانجی دیاریکراوو وا قعی و تواناى پێوانی هەبێت.

تاکی بەشداربو لە خولەکەدا کە دەتەوێت ڕاهێنانی پێبکەیت﴿فێرخواز﴾ پێویستە لە سەرەتای دەستپێکردنی خولەکەوە بەشداری بکەیت لە ئاستەکانی یەکەمی خولەکەدا.

بەشداری پێکردنی لە دیاریکردنی پێداویستیەکانی ڕاهێنانەکە ئەمەش بۆ ئەوەی هانبدرێت و هەستبکات کە ئەو بەرپرس و هاوبەشە لەو کارەدا.

ڕاستیەکی جێگیر لە ناوەندەکانی ڕاهێناندا هەیە ئەویش بریتیە لە کاریگەریتی پلانی بەرنامەکانی ڕاهێنان و نەخشەکێشان و جێبەجێکردن و هەڵسەنگاندنیان لە بناغەدا پشتدەبەستێت بە کاریگەریتی کرداری دەستنیشانکردنی پێداویستیەکانی ڕاهێنان چونکە دیاریکردنی پێداویستیەکانی ڕاهێنانەکە جۆراوجۆرکردنی ڕاهێنانەکان و دیاریکردنی شوێن و شێوازی ڕاهێنانەکان و بەشداری جۆرەکانی کەسایەتیەکان دیاری دەکات.

## دیاری کردنی پێداویستیەکانی ڕاهێنان و تایبەتمەندیەکانی و تێگەیشتن لێی :

دیاریکردنی پێداویستییەکانی ڕاهێنان و تێگەیشتن لێی پشت دەبەستن بەو بۆشاییەی لە ئاستی ئێستای تاکەکەدا هەیە پێش بەشداریکردنی لە خولەکەداو ئەو ئاستەی لێیچاوەڕوان دەکەیت پاش خولەکە.

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت بۆ ئەوەی بتوانین پێداویستیەکانی تاکێك بۆ ڕاهێنان دەستنیشان بکەین پێویستە ئاستی نمایشی(ڕۆڵی) ئێستایی و ئەو ئاستەش کەلێی داواکراوە بگات پێیدەستنیشان بکەین.

لەبوارە کارگێریە جیاجیاکاندا کە دەمانەوێت پێداویستیەکانی ڕاهێنانیان بۆ دیاریبکەین پێویستە ڕەچاوی ئەو بۆشایانە بکەین کە لە ئاستی کارکردنی فەرمانبەرەکاندا هەیەو هەلی بەشداری کردنیان بۆ برەخسێنین لەو خولە ڕاهێنانەی یارمەتیان دەدات بۆ خۆبەهێزکردن لە بواری کارەکەیدا و گواستنەوە بۆ ئاستێکی بەرزو بەهێزتر.

## چەند پێناسەیەکی جیاواز بۆ پێداویستیەکانی ڕاهێنان هەیە لەوانە:

- بریتیە لەو گۆڕانکاریانەی لە تاکەکاندا دەکرێت لە ئاستەکانی فێربون و کارامەیی و ئاراستەکان بۆ ئەوەی یارمەتیان بدات لە سەرکەوتن بەسەر ئەوکێشانەی لە کاری (ادا ) فەرمانبەرەکان ڕووبەڕویان دەبێتەوە.
- کۆمەڵە زانیاریەکە پێویستی بەنوێکردنەوە یان دەستکاریکردن یان گۆڕین هەیە بەهۆی ئەو گۆڕانکاریانەی ڕودەدات لە بواری زانستی و مرۆیی و تەکنەلۆژی و ڕێکخستنەوەیان.
- پڕکردنەوەی ئەو بۆ شاییانەی هەیە و داواکراوە نەمێنێت.
- کۆمەڵێك گۆڕانکاری داواکراوە تایبەت بەتاك سەبارەت بە زانینی ئاستی زانیاری و کارامەیی لە کارداو شارەزابونی لە یاساکانی کارکردن بۆ ئەوەی ئامادەکراو بێت بۆ گونجاندن لەو کارەی پێی ڕادەسپێردرێت و بەلێهاتویی جێبەجێی بکات .

## گرنگی و سودەکانی دیاریکردنی پێداویستیەکانی ڕاهێنان

وا دیارە گرنگی دیاریکردنی پێداویستیەکانی ڕاهێنان بە ڕێگای زانستی لێکۆڵینەوەیەکی دەوێت لە پێشنیارکردنی پرۆگرامێکی ڕاهێنان و بەشداری پێکردنی کۆمەڵە تاکێك کە پەیوەندی شارەزایان نەبێت بەو پرۆگرامەوە کە ئەمەش هۆکارێکی سەرەکیە بۆ سەرنەکەوتنی ئەو جۆرە پرۆگرامانە.

دیاریکردنی پێداویستیەکانی ڕاهێنان بەشداریدەکات لە چۆنیەتی ڕێنمایکردنی پارەخەرجکردن بۆ ئەو جۆرە پرۆگرامانەی ڕاهێنان.

دەتوانین بڕوانینە گرنگی دیاریکردنی پێداویستیەکانی ڕاهێنان لە هەمو ئەو سودبەخشیەی لەو جۆرە ڕاهێنانە وەردەگیرێت بۆ دیاریکردنی پێداویستیەکان بەپێی زانستە نوێیەکان.

کۆکردنەوەی لێکۆڵینەوەکان سەبارەت بە دیاریکردنی پێداویستیەکانی ڕاهێنان لەچەند سودێکدا خۆی دەبینێتەوە لەوانە:

١- دیاریکردنی پرۆگرامێکی زانستیانە بۆ پێداویستیەکانی ڕاهێنان بە شێوەیەکی دیارو ڕێك و پێشنیارکردنی پرۆگرامێکی ڕاهێنان بە تێچونێکی کەم و بەشداری پێکردنی کەسانی گونجاو بۆ پرۆگرامەکە بەرەو سەرکەوتن دەتبات.

٢- دیاریکردنی پێداویستیە گرنگەکان (فعلیە) یارمەتی دەرێکی باش دەبێت بۆ گەشەپێدانی سەرچاوە مرۆیەکان دەستنیشانکردنی

پێداویستیە پێویستەکان بۆ ڕاهێنان وا لە فەرمانبەرەکان دەکات بەرچاو ڕونیەکیان هەبێت لە دوارۆژی کرێکارەکان لە ڕێکخراوەکە.

٣- بەتواناکردنی تاکەکان بە دورکەوتنەوەیان لە هەڵەکردن لە کاتی ئەنجامدانی کارەکانیان هەرچەندە بچوکیش بێت و گەیشتنیان بەو ئاستەی لێیان داواکراوە بەخشینی هەلی بەشداربون بە فەرمانبەرەکان و دەربڕینی بۆچونی خۆیان لەسەر ئەو پرۆگرامەی دەگونجێت لەگەڵ کارەکانیاندا.

٤- هەلێکە بۆ سەرپەرشتیارو سەرکارەکان ئاستی نمایش کردنی فەرمانبەرەکانیان بزانن و ئەو کێشانەشیان بۆ دەربکەوێت کە لە ڕێگەیان و پاشان پێداویستی گونجاو بۆ ڕاهێنانیان دیاریبکەن.

٥- یەکەم هەنگاوی پلان دانان بۆ ڕاهێنان لەلایەن چەند کارگێڕییەکی جیاوازەوە دادەنرێت ئەویش لە ڕێگەی بەراوردکردنی جۆری کارەکان لەگەڵ توانای ئەو فەرمانبەرەی کارەکەی پێرادەسپێردرێت پاشان دڵنیابون لەوەی ئەو فەرمانبەرە شایستەی ئەوکارەیە بەو شێوەیە ئەو فەرمانبەرانە دەستنیشان دەکرێن کە پێویستییان بە ڕاهێنان هەیە .

٦- دیاریکردنێکی زانستیانە بۆ پێداویستییەکانی ڕاهێنان کارئاسانی دەکات بۆ پلان دانان لە ڕوی داراییەوە بۆ ئەوەی بتوانرێت پارەی تەواو بۆ خولەکەو جێبەجێکردنی پرۆگرامەکە بەسەرکەوتوی دابنرێت.

٧- دیاریکردنی پێداویستیەکانی ڕاهێنان بۆ خولێك ئاراستەی ئەو بڕیارانە سەبارەت بە ڕاهێنان لە خولەکەو کارئاسانی دەکات بۆ کارگێڕیەکان لە بواری فەرمانبەرەکان یان لە کارگێڕی ڕاهێنان یان لە پەیمانگاو سەنتەرەکانی ڕاهێنان.

## بەرپرسیارێتی دیاریکردنی پێداویستیەکانی ڕاهێنان

دیاریکردنی پێداویستیەکانی ڕاهێنان بە دو قۆناغ تەواو دەبێت...

قۆناغی یەکەم: دیاریکردنی سەرەتایی پێداویستیەکانی ڕاهێنان:

لەم قۆناغەدا بەڕێوەبەر یان سەرۆکی بەش هەست بەبونی گرفتێك دەکەن کە پێویستی بە گەڕان و شیکردنەوە هەیە بۆ چارەسەرکردنی، ئەگەر بەو پێداویستیانەی بۆی تەرخانکراوە لە شێوازو کەلوپەلەکان نەیتوانی چارەسەری کێشەکە بکات لە سنوری ئەو دەسەلاتەی هەیەتی، ئەوکاتە لەوانەیە تاکەکە خۆی ڕاستەوخۆ هەڵوێست وەربگرێت ئەو کەلوپەل و پێداویستیانەی بۆ ڕاهێنانەکە دەیەوێت بە سەرۆکی بەشەکەی بڵێت.

قۆناغی دووەم: دیاریکردنێکی تەواو بۆ پێداویستیەکانی ڕاهێنان:

لەم قۆناغەدا کێشەکە ڕوبەڕوی بەرپرسی ڕاهێنان لە کۆمپانیا دەکرێتەوە کە شارەزایە لە بوارەکەدا، ئەگەر چارەسەرکردنی کێشەکە لە توانای ئەودا نەبو، ئەوا دەبێت کەسێکی پسپۆڕ لە دەرەوەی کۆمپانیا بهێنن بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشەیە، ئەوکاتە ئەویش دەستدەکات بە

گەڕان و کۆکردنەوەی زانیاری تەواو لەسەر کێشەکەو هەوڵی دۆزینەوەی چارەسەری تەواو و گونجاو بۆ کێشەکە دەدات.

کەواتە کرداری دیاریکردنی پێداویستییەکانی ڕاهێنان بە کۆشش و هاوکاری نێوان ژمارەیەك تاکەکان بەم شێوەیە دیاری دەکرێت:

بەرپرسیارێتی دیاریکردنی پێداویستیەکانی ڕاهێنان بریتیە لە کردارێکی هاوبەشی، چونکە لە ئەنجامی هاوکاریەکی هاوبەشی نێوان چەند کەسێك و کۆششێکی زۆر دروستدەبێت، ڕاهێنراوەکە خۆی بەشداری لەم کارەدا دەکات بەهۆی زانین و شارەزایی زیاتری لە سروشتی کارەکەیی و ناسینی جۆرەکەی، سەرۆکی بەشەکەشی لە زانینی دەربارەی سروشتی کاری تاکەکان و چییان پێویستە لە زانیاری و کارامەیی لە کاتی کارکردنیاندا بەشداردەبێت، هەروەها بەرپرسی ڕاهێنانیش لە کۆمپانیاکە بەشدارە چونکە ئەو هەمیشە پەیوەندی بەردەوامی هەیە بە ڕاهێنراوەکانەوە، جگە لە پشتبەستنی کۆمپانیاکە بە هێنانی چەند ڕاوێژکارێکی شارەزا لە بوارەکەداو پشتگیریکردنی دەستەی کارگێڕی بالا بۆ چالاکیەکانی ڕاهێنانەکە.

## بەرپرسی پێداویستیەکانی ڕاهێنان بەپێی ئەم ڕیزبەندیەیە:

### یەکەم: تاکەکان خۆیان [فەرمانبەرەکان خۆیان] :

ئەمانە بە سەرچاوەی سەرەکی دیاریکردنی پێداویستیەکانی ڕاهێنان دادەنرێن چونکە خۆیان شارەزایی تەواویان هەیە بە کەموکورتیەکانیان

و زیاتر توانای دیاریکردنی پێداویستییەکانی ڕاهێنانەکەیان هەیە بە وردی.

ئەمە لە لایەك پێداویستیە کەسییەکانیش شارەزان لە لایەکی ترەوە واتە زانینی ئاستی زانیاری وکارامەییەکان .

## دووەم : سەرۆکی ڕاستەوخۆ :

ئەو کەسەیە کە سەرپەرشتیاری گشتی کارەکان دەکات و ئاگاداری سروشتی کارکردن و ئاستی تاکەکانە و دەزانێت پێویستیان بە چ جۆرە ڕاهێنان و پێداویستیەك هەیە بۆ بەهێزکردنیان و پێشخستن و ئەنجامدانی کارەکان بە وێنەیەکی جوان.

## سێیەم : کەسانی هەڵسوڕێنەرو کارگێڕی خولی ڕاهێنانەکە:

بریتین لەو کەسانەی بە شێوەیەکی فەرمی ڕاسپێردراون بە دیاریکردنی پێداویستییەکانی ڕاهێنانەکەو بە شێوەیەکی بەردەوام پەیوەندیان لەگەڵ فەرمانبەرەکاندا هەیەو پرسیاریان لێدەکەن بۆ کۆکردنەوەی زۆرترین زانیاری، ئەمەش کارئاسانیەکی باشیان بۆ دەکات لە دیاریکردنی پێداویستیەکانی ڕاهێنانەکە.

## چوارەم : ڕاوێژکارە دەرەکیەکان:

کۆمەڵە کەسێکی شارەزان سەر بە دەزگایەکی ڕاوێژکاری سەربەخۆن لە بواری ڕاهێناندا.

## پێنجەم: پشتگیری کردنی دەستەی باڵای کارگێڕی:

دەستەی کارگێڕی باڵا ڕۆڵێکی سەرەکی هەیە لە پشتگیریکردن دیاریکردنی پێداویستیەکانی ڕاهێناندا چونکە هەمو ئەو کۆشش هەوڵانەی پێشتر باسمان لێکردون تەواو نابن و سەرکەوتوش نابێ ئەگەر پشتگیریەکی تەواو لە دەستەی باڵای کارگێڕیەوە ئاسان کاریان پ نەکرێت.

کەواتە: هیچ لایەنێك لەو لایەنانە توانای دیاریکردنی پێداویستیەکا ڕاهێنانی نیە بەبێ بونی لایەنی پەیوەندیدار کە ڕاهێنراوەکەیە چونک بێ ئامادەبون و بەشداری پێکردنی ئەو دایبنێ کە بەرنامەی ڕاهێنان هیچ سودێکی بۆ ئەو نیە چونکە لێی تێناگات.

لەوانەیە ئەو پێداویستیانەی بۆ ڕاهێنانەکەش دابینکراوە هی سودێکی پێنەگەیەنێت چونکە بەپێی پێویستی ئەو نیە ئەوکاتە هەڵسوڕێنەرانی خولەکە توانای خۆیان بۆ دەرناکەوێت تا چ ڕادە سەرکەوتو بون.

١- جۆرەکانی پێداویستیەکانی ڕاهێنان [اصناف الاحتياجات التدريبيه]

چەند ڕێگەیەك هەیە بۆ دیاریکردنی پێداویستیەکان لەوانە:

A/ پۆلێنکردنی بە پێی ئامانج :

- پێداویستی ئاسایی بۆ بەهێزکردن و چاکردنی ئاستی نمای ئەندامەکان وەك خولی «دادوەرەکان، فەرمانبەرە تازە دامەزراوەکان»

• پێداویستیە کردارییەکان بۆ بەرزکردنەوەی لێهاتویی کار وەك ئەو خولانەی پەیوەندیان بە دەرکردنی یاسایەکی نوێوەو چۆنیەتی جێبەجێکردنی یاساکەوە هەیە یان بونی گیروگرفتێك لە کاردا یان کردنەوەی کۆمەڵە خولێکی جیاواز تایبەت بێت بە پسپۆری لە لقەکانی یاسا جیاجیاکان یان ستەمی بەڕێوەبردنی دانیشتنەکان.

• پێداویستیە پێشکەوتوەکان بۆ زیاتر کاریگەرکردنی سیستەمی(دەزگای)دادپەروەری وەك کردنەوەی خولی ئامادەکردنی کادری دادوەری و سەرۆکی فەرمانگەکان و سەرۆکی دادگاکان و ئەندامانی نوسینگە حکومیە هونەریەکان بە مەبەستی بەدەستخستنی کۆمەڵە کادرێکی نایاب لە داهاتودا بەپێی نەخشەی پێویست بەکادێران.

## B/ پۆلێن کردنیان بەپێی ماوەی دیاری کراو:

• پێداویستیە خێراکان وەك ﴿کتوپڕی _ نەخشەنەکێشراو _ پلان بۆ دانەنراو﴾.

• پێداویستی بۆ داهاتویەکی نزیك وەك ﴿پلان بۆ دانراو﴾.

• پێداویستی داهاتویی وەك ﴿گەشەپێدان بێت -- پلانی دوربین﴾

## Cپۆلێن کردنیان بەپێی چڕی و بارستایی ڕاهێنانەکە:

• پێداویستی تاکەکەسی.

• پێداویستی بە کۆمەڵ.

## پۆلێن کردنیان بەپێی ڕێگاو شێوازی ڕاهێنانەکە:

- پێداویستیەکان بۆ ڕاهێنانێکی کرداری لە شوێنی کارەکەی (کرد - عملی)
- پێداویستیەکان بۆ ڕاهێنانێکی زانستی لە هۆڵدا (تیۆری - نظری)

D/پۆلێن کردنیان بەپێی شوێن یان لایەنی ڕاهێنانەکە:

- پێداویستی ڕاهێنان لە کاتی ئیشکردندا بە پشتبەستن بە شارەزا ناوخۆیی
- پێداویستی ڕاهێنان لە دەرەوەی سنوری کارەکە بە پشت بەستن ڕێکخراوو ناوەندەکانی ڕاهێنان یان دەزگا هاوشێوەکانیان.

## ٢- ئاستەکانی پێداویستییە ڕاهێنراوەکان

دەتوانین سەیری ئاستی پێداویستیەکانی ڕاهێنان و جۆرەکانی بکەین لە ڕوی:

A - ئاستی تاکەکان: ئەمە خاڵی سەرەتایە بۆ دیاریکردنی پێداویستیەکان چونکە هەمو ڕاهێنراوێك چەند پێداویستیەکی تایبەتی خۆی هەیە کە پەیوەستە بە جۆرو سروشتی کارەکەی هەروەها پەیوەندی بە ئاستی ڕۆشنبیری و کەسایەتی و زانیاری و شارەزابونی کارەکەشدا هەیە.

سەرنج خستنەسەر پێداویستیەکانی ڕاهێنان بۆ تاکەکان وا دەکات بتوانرێت بەرنامەیەکی ڕاهێنانی چڕوپڕو سەرکەوتو کە هەم بۆشایەکان دیاری بکات و پڕبکرێتەوە و ئاسان کاری زیاتر دەکات

بەدەست هێنانی ئامانجەکان لە ڕاهێنانەکە بەو شێوەیەی خاوەن پەیوەندیدارەکان هیوای پێدەخوازن.

B - ئاستی کۆمەڵەکان: ئەم جۆرە لە پێداویستیەکان پەیوەندی بە کۆمەڵە تاکێکەوە هەیە خاوەنی یەک پسپۆڕین و پێویستیان بە یەک جۆری هاوبەش لە پێداویستیەکانی ڕاهێنان هەیە.

C - ئاستی دەزگا یان ڕێکخراوەکان: تاکەکان و کۆمەڵەکان هەمویان بەیەکەوە لە چوارچێوەی دەزگا یان ڕێکخراوێك کاردەکەن.

دەزگاکانی ڕاهێنان لەوانەیە لەیەك کاتدا پێداویستیە تاکیەکان و کۆمەڵیەکان بەیەکەوە کۆبکاتەوە ئەو کاتە نەخشە بۆ ئەنجامدانی پرۆگرامەکانی ڕاهێنان بە شێوەیەك دادەڕێژن گونجاو بێت لەگەڵ ئەو پێداویستیانەی هەیە بۆ تاکەکان و کۆمەڵەکانیش لە لایەك, لە لایەکی تریشەوە پێداویستیەکانی وەزارەتەکە یان دەزگاکە بەگشتی بەهەمان شێوە لەوانەیە لەلایەن بەرپرسانی کارگێڕیەوە دەستنیشان بکرێت بۆ چارەسەرکردنی کۆمەڵێك کێشە کە پەیوەندی بە وەزارەتەکەوە یان دەزگاکەوە هەیە بەگشتی بۆیە کۆمەڵە پرۆگرامێکی وا دادەنێن بۆ ڕاهێنان کە ئەو کێشانە چارەسەربکات.

D- ئاستی هەرێمەکان: ئەم ئاستە کرداری دیاریکردنی پێداویستیەکانی ڕاهێنان بۆ دەزگایەکی گەورە لەخۆ دەگرێت کە لقی زۆری لە هەمو شوێنێکدا هەیەو یەك هەرێمی جوگرافی کۆیکردونەتەوە

بەڵام هەمو لقەکان یەك جۆر لە پسپۆڕی و ڕۆشنبیری و سیاسی و
ئابوری هاوبەش کۆی کردونەتەوە.

E - ئاستی نێودەوڵەتی: تێکەڵبون و بەهێزبونی پەیوەندیەکانی
نێوان پارچەکان لە جیهاندا بەهۆی شۆڕشی پۆستەو گەیاندن و
دروستبونی بازاڕی جیهانی هۆکاری ئەوەن بتوانرێت پێداویستیەکان
دەستنیشان بکرێت بۆ کۆمەڵێکی دیاریکراو لە بەرپرسان یان بۆ چارە
سەرکردنی کێشەیەك کە نێودەوڵەتی بێت, بەشداریکردنی دەزگا
نێودەوڵەتیەکان بەڕونی لێرەدا ڕۆڵی خۆیان دەبینن.

باسەکانی پێداویستیەکانی ڕاهێنان هەر جۆرو بابەتێك بێت هەموی
باس لە یەکشتدەکەن ئەویش چۆنیەتی گەیشتن بە ئامادەکردنی
بەرنامەیەکی چڕوپڕە بە مەبەستی دیاریکردنیکی ڕون و وردبۆ
بارستایی و جۆری داواکراوی پێداویستیەکانی ڕاهێنان.

پێداویستیەکانی ڕاهێنان هەمیشە لە تازەگەری بەردەوامیدایە لە
هەمو ناوەندەکان و ئاستەکاندا خۆی دەردەخات بۆیە لە هەندێك کاتدا
وا پێویست دەکات کە گۆڕانکاری لە جۆری پێداویستیەکاندا بکرێت
لەوانە:

- ئامادەکردن و ڕێخۆشکردن بۆ پێشکەشکردنی بەرنامەیەکی باش بۆ
ئەو تاکانەی تازە دادەمەزرێن بۆ کارکردن لە کۆمپانیا بێت یان
دەزگاکانی حکومەت.

- بەرزکردنەوەو شوێنەوار(الندب) ئەمەش هۆکارێکە بۆ زیادکردنی بواری مادی و ڕەوشتی کارمەندەکان.
- گۆڕینی شوێنی کارمەندەکان و گواستنەوەیان لە کارێك یان فەرمانگەیەك بۆ کارو فەرمانگەیەکی تر.
- گۆڕانکاری تەکنەلۆژی لە چاکردن و گۆڕینی ئامێرەکان و شێوازی نوێ لە کارکردن.
- گۆڕینی شوێنی فەرمانبەرەکان و بەرزکردنەوەیان بە پێی پسپۆڕیەکان لە کارەکانیاندا یان پەرەپێدانی جۆرەکانی دامەزراندن لە کاتی کردنەوەی لقێکی نوێی کار بە هەمان شێوە لە کوالیتی کۆمپانیا لە وڵات یان شار یان هەرێمێکی تر.

لە کاتی دروستبونی کێشەیەکی تایبەت بە کۆمپانیاکە وەك ﴿دابەزاندنی ئاستی بەرهەم هێنان یان خراپی پەیوەندیەکان یان لاوازی پلەی کێبڕکێکردن لە بازاڕدا یان .. هتد﴾ پێویست دەکات ڕاهێنان بە کارمەندەکان بکرێت.

## ڕێگاکانی دیاریکردنی پێداویستیەکانی ڕاهێنان

سێ ڕێگا لە بەردەم پسپۆڕی ڕاهێنانەکەدا هەیە بۆ دیاریکردنی پێداویستیەکانی ڕاهێنان:

**ڕێگای یەکەم- شیکردنەوەی سیستەم:** لەم ڕێگەیەوە وەڵامی پرسیارێکی گرنگمان دەستدەکەوێت کە بریتیە لە کێ و لە کوێ پێویست بە ڕاهێنان دەکەن؟

لە چ فەرمانگەیەك یان لقێك یان بەشێك؟

ڕێگای دووەم- شیکردنەوەی جۆری کارەکە: ئەمەشیان ب
وەڵامدانەوەی پرسیارێکی تری گرنگە کە بریتیە لە:

جۆری ڕاهێنانی پێویست و داواکراو چیە؟﴿ کارامەیی - زانیاری
ئاراستەکان﴾ پاشان کردارەکە یان بەشێك لە ئەرکەکە کامەی
پێویستی بە ڕاهێنانە!

ڕێگای سێیەم- شیکردنەوەی تاکەکە: ئەمیش بە ڕۆڵی خ
وەڵامی پرسیارێکی گرنگ دەداتەوە کە بریتیە لە ﴿چی و کێ پێویس
بە ڕاهێنانە؟ ﴾

ڕونکردنەوەی هەرسێ ڕێگاکە لەم وێنەیەدایە

شیکردنەوەی سیستەم

پێداویستیەکانی ڕاهێنان لە کوێن

کارامەیی وکاریگەری ڕاهێنان

کێ پێویستی بەڕاهێنانە

پێداویستیەکانی ڕاهێنان کامانەن

شیکردنەوەی تاك

شیکردنەوەی کار

## ڕێگای یەکەم: شیکردنەوەی سیستەم

ئامانجی ڕێکخستنی گونجاندنی ئەو پلانانەیە کە دانراون بۆ خولەک «پلانی کارکردن و کاریگەریتی ئەو ڕێکخستنانەو دەستنیشان کردنی کەموکورتیەکان و چاککردنیان» بۆ ئەوەی کاریگەرتر بێت.

ئەرکی جێبەجێکردن و ڕێکخستنی ئەو پلانە دەکەوێتە سەرشانی بەرپرسی ڕاهێنانەکە ئەویش بە هەڵسانی بە لێکۆڵینەوەو شیکردنەوەی ئەم سەرچاوانە «ئامانجەکانی کۆمپانیا, بناغەی ڕێکخستنەکەی سیاسەت و دەرهاویشتەکانی (السیاسەولوائحها), هەیکەلی کارەکەی (الهیکل الوظیفي ), هێزی کار و تایبەتمەندیەکانی کۆمپانیا, پلەکانی کارامەیی ,ئیستیغلال کردنی ئەو کەرەستانەی لە بەردەستدان ڕێکخستنی کەسێکی گونجاو کە ئەم شتانە دەگرێتەوە (پاداشت – موچە – پەیوەندیەکان - پەیوەندی نێوان سەرۆك کارو هاوڕێکان – متمانەبوون – بەرپرسیارێتی - لە کۆتایدا جۆری ئەو گۆڕانکارییانەی لە سەرچاوەکانی پێشودا ڕویداوە».

## ڕێگای دووەم: شیکردنەوەی کارەکە:

ئامانجی دیاریکردنی ئاستی کارامەیی و زانیاری تاکەکانە بۆ پێوانەکردنی داواکاریەکان بەدەست خستنیان ئەم کارەش بە لێکۆڵینەوەو شیکردنەوەی کۆمەڵە سەرچاوەیەك دەکرێت لەوانە:

﴿وەسفکردن یان باسکردنی کارەکە، مواصفاتی داواکراو لە کەسەکە، ئامانجەکانی کارەکە، بوارەکانی ئاکامەکان، ئەدای کارکردن، ئەو گۆڕانکاری و چاکسازیانەی بەسەر ئەم سەرچاوانەدا دێت﴾.

## ڕێگای سێیەم :شیکردنەوەی تاکەکان :

ئامانجی ناسینی جۆری ئەو زانیاری و کارامەیانەیە کە تاکەکە بۆ ڕاپەڕاندنی کارەکە پێویستی پێیە بۆ ئەوەی ئاستی کارکردن و بەرهەم هێنانی زیادبکرێت و پاڵنەرە فرمانی و کەسێتیەکەی تێربکرێت.

لەبەرئەوە بەرپرسی ڕاهێنانەکە لێکۆڵینەوە لە سەرئەم شتانە دەکات:

مواصفاتی (جۆرێتی): ﴿ تاکەکە بۆ کارەکە، تواناکانی، شارەزایی، کارامەیی، تایبەتمەندیە کەسێتیەکان کە تێیدایە، ئاراستەو پاڵنەرەکانی، ئامادەیی بۆ فێربون، ئەو پێداویستیانەی دەیەوێت بیری بخاتەوە، ئاستی ژیری، تەمەن و ڕەگەزی تەندروستی گشتی، لایەنی هەڵسوکەوتی تاکەکە بۆ زانینی ئاستی تێکەڵبونی لەگەڵ هاوڕێکانی و ئامادەبونی بۆ هاوکاری کردنیان.

## پڕۆگرامەکانی دیاری کردنی پێداویستییەکانی ڕاهێنان :

سێ پڕۆگرامی زانستی هەیە بۆ دیاریکردنی پێداویستیەکانی ڕاهێنان بریتین لە :

### یەکەم : پڕۆگرامێکی ئاسایی :

ئەم پڕۆگرامە زۆرێک لە شێوازەکانی پێداویستیەکانی ڕاهێنان لە خۆی دەگرێت بەڵام سەرنج دەخاتە سەر چوار شێواز کە بەم شێوەیەیە:

- شێوازی یەکەم: پشت بە ڕوپێوکردنی پێداویستیە
ڕاهێنانەکە دەبەستێت و دەروازەیەکیشە بۆ دیاریکردنی ئاستی زانی
کارامەیی تاکەکەو نابەسترێتەوە بە ئەدای ڕاستەقینەی تاکەکە.
- شێوازی دووەم: سەرنج دەخاتە سەر لێکۆڵینەوەی نو
کارامەیی تاکەکەو دیاریکردنی تواناکان نابەسترێتەوە بە ئ
ڕاستەقینەی تاکەکە.
- شێوازی سێیەم: سەرنج دەخاتە سەر شیکردنەوەی فرمان
گرنگی بە شێوازی دەستپێکردنی دەدات.

کۆتاشێواز: بریتیە لە شیکردنەوەی ئەداکان سەرنج دەخات
دەرچونی جۆری کارو کردارەکەو کارامەیان بۆ ئەو دەستک
دەستدەکەوێت بۆ هەمو کارێك.

دووەم: پرۆگرامێکی پێوانەیی بۆ دیاریکردنی پێداویستیە
ڕاهێنان

ئامانجی ئەم پرۆگرامە جیاکردنەوەی هەڵوێستەکانە لە نێوان
ساتانەی پێویست بە ڕاهێنان ناکات.

بەو شێوەیە ڕێنمایی تواناکانی ڕاهێنانەکە دەکرێت ئەم شێوازش
حەوت هەنگاو جێبەجی دەکرێت:

١) دیاریکردنی لایەنە لاوازەکان لە ئەدا دا.

٢) پۆلێنکردنی کێشەکان بە پێی ئاستەکانی ﴿تاك – کارەکە - دەزگا یان ڕێکخراوەکە – سیاسەتی گشتی﴾ مەبەست لە سیاسەتی گشتی ئەو ڕێگریانەیە کە دێتە بەردەم ڕێکخراوەکە.

٣) پۆلێنکردنی کێشەکان بەپێی هۆکارەکان یان سەرچاوەکانیان وەك کەمی کارامەیی و پاڵنەرو کاریگەرە ژینگەیەکان.

٤) پۆلێنکرنی هەڵوێستەکان بەپێی ئاستی ئەو مەترسیە چاوەڕوان کراوانەی ڕوبەڕو دەبێتەوە لە کاتی ڕاهێنانەکەدا بۆ نمونە: دەتوانرێت کێشەی کەمتەرخەمی ئاستی جێبەجێکردنی فەرمانبەران بۆ کارەکانیان بە ڕاهێنان چارەسەربکرێت بەلأم ئەستەمە بتوانرێت کێشەیەکی سیاسی گشتی بە ڕاهێنان چارەسەر بکرێت, لێرەوە جیاکردنەوە بۆ جۆری ئەو کێشانە دەکرێت کە دەتوانرێت بە کردنەوەی خولی ڕاهێنان چارەسەربکرێت.

٥) پۆلێنکردنی هەڵوێستەکان بە پێی ئەگەرەکانی گۆڕانکاری ئەو سەرچاوانەی هەڵوێستەکەیان دروستکردوە کە بریتین لە چوار بوار ﴿تاکەکان - سامانەکان(موارد)-ئامانج و چوارچێوەی دەزگایی - سنوری دەزگایی﴾.

٦) پۆلێنکردنی هەڵوێستەکان بەپێی چوارچێوەی کات ئەمەش دیاریکردنی کاتێك دەگرێتەوە بۆ ئەنجامدان و گەیشتن بە ئامانجەکان لە ڕاهێنانەکەو دیاریکردنی کاتی دەرکەوتنی داهاتەکان لەو ڕاهێنانەو ماوەی خاوی نێوان دەرکەوتنی پێداویستییەکان و دەرکەوتنی داهاتەکان

کارامەیی ڕاهێنانەکە دەردەخات بەڵام زیادکردن و درێژکردنەوەی ...
ڕاهێنانەکە ئاماژە بە کاریگەرنەبونی ڕاهێنانەکەدەکات.

٧) دیاریکردنی جۆری (ماهیە) پێداویستیەکانی ڕاهێنان لە ...
ڕۆشنایی هەنگاوەکانی پێشو لە ڕوی شوێنەکانی پێویستیەکانی ڕاهێ...
و بارستایی ئەو بۆشایە ڕاهێنانەی هەیە لە ڕوی ژمارەو ...
دیاریکراوو ناوەڕۆکی بابەتەکانی ڕاهێنانەکە لە ڕوی ناسین و کار...
داواکراو.

سێیەم: پرۆگرامێکی سەرکەوتو بۆ دیاریکردنی پێداویستیە...
ڕاهێنان:

ئەم پرۆگرامەش لە حەوت هەنگاو پێکدێت کە بریتین لە:

١) ئامانج لە دیاریکردنی پێداویستیەکان زیادکردنی زانیاری ...
کارامەیی یان پێشخستنی لایەنێکە.

٢) دیاریکردنی بۆشایەکە لە نێوان جێبەجێکردنی ئێستاو ئاما...
پێکراوەکەدا لە ڕێگای ؛

- دیاریکردنی شێوەی کارەکە.
- شیکردنەوەی کارەکە بۆ زانینی پێداویستیەکان و جێبەجێکردن...
- دیاریکردنی ئاستەکانی جێبەجێکردنی زانیاریەکان.
- شیکردنەوەی ئامانجەکانی هەڵسەنگاندنی ساڵانە.
- شیکردنەوەی ئەو هەڵوێستە نارەحەتانەی لە کاتی ئەنجامدا...
ڕاهێنانەکە دەردەکەوێت .

- شیکردنەوەی داواکاری و پێویستیەکانی بەرزبونەوەی پلە.
- چاوپێکەوتن لەگەڵ فەرمانبەری کارەکە.

٣) دیـاریکردنی ئامانجـەکان لـە ڕێگـای سـەرنج خستنەسـەر تاکەکـەو کارەکەو دەرچوەکانی کار.

٤) سـەرنج خستنەسـەر پەیوەنـدی نێـوان جێبـەجێکردن و داهـاتی ئامانجە پێکراوەکە (المستهدف).

٥) پێوانـەکردنی ئاسـتی سـەرکەوتنی ڕاهێنانەکـە لـە پڕکردنـەوەی بـۆ شایەکە.

٦) گۆڕینی پێداویستیەکان بۆ ئامانجی ڕاهێنان گرنگترینیان:

- زانین و شارەزایی لە کارەکە.
- کارامەیی لە جێبەجێکردنی کارەکە.
- توانـای سـەرکەوتن لـە بـەدیهێنانی داهـاتی داواکـراو (المخرجات المطلوبة).
- هاوکاریکردن و ڕێکەوتن لەگەڵ کاری ئەوانی تر لە ڕێکخراوەکە.
- خۆگونجانـدن لەگـەڵ فەلسـەفەو دوربینیـەکانی پێویسـتیەکانی ڕێکخراوەکە.

٧) لە کاتی نەخشەدانان بۆ ڕاهێنانێك پێویستە ڕەچاوی ئـەم خاڵانـەی لای خوارەوە ببین:

- ئاستی ڕاهێنەرەکە.
- زنجیرەیـی لـە بابـەتی ڕاهێنانەکـەدا (ڕیزبەنـدی لـە بابـەتی ڕاهێنانەکەدا).

- هەنگاونان لە بابەتە سوکەکانەوە بەرەو بابەتە قورسەکان.
- بەشداری پێکردنی ڕاهێنراوەکە.
- کارامەیی ڕاهێنەرەکە.
- ئامادەکرنی پێداویستیە یارمەتی دەرەکان بۆ ڕاهێنانەکە.

## ڕێگرییەکانی (اشکالیات) دیاریکردنی پێداویستیەکانی ڕاهێنان

یەکەم: بۆچی لە زۆرینەی دەزگاو ڕێکخراوەکاندا پێداویستیەکانی ڕاهێنان بە شێوەیەکی زانستی دیاری ناکرێت؟

وەلامدانەوەی ئەو پرسیارە لەم بنچینانەی خوارەوەدایە بە کورتی:

- تێنەگەیشتنی لێپرسراوانی کارگێڕی دەزگاو ڕێکخراوەکان بۆ گرنگی دان بە پێداویستیەکانی ڕاهێنان.
- پەلەکردن لە جێبەجێکردنی پڕۆگرامەکانی ڕاهێنان کاتێک ڕێگەنادات بەچاوەڕوان کردن بۆ دیاریکردنی ڕاستەقینەی (فعلی) پێداویستیەکانی ڕاهێنان.
- گرنگیدان بە چەندێتی نەك چۆنیەتی بەرنامەکانی ڕاهێنان واتە گرنگیدان بە ژمارەی ئەو ڕاهێنەرانەی لە خولی ڕاهێنانەکەدا دەردەچن نەك گرنگیدان بەو زانیاری و کارامەیی و ڕەوشتانەی فێری دەبن لە خولەکەدا.
- ڕاسپاردنی کاری ڕاهێنانەکە بە کەسانی کەم ئەزمون و نەشارەزا لە بواری ڕاهێناندا.

• سەرچاوەکانی تێچون (عناصر التكليف).

• ئیروانینێکی سادە لە لایەن دەستەی باڵای کارگێری بۆ ڕاهێنانەکەو گرنگی ئەدان بە بەشداربووەکان بۆ ئەوەی خولەکە سەرکەوتوبێت پێویستە هاوکاریەکی تەواو لە نێوان بەشداربوان و دەستەی کارگێری هەبێت.

• بەرپرسانی پەیوەندی دار لە نەخشەو بەدواداچون بۆ ڕاهێنانەکە.

دووەم: بۆچی پرۆگرامەکانی ڕاهێنان لە زوربەی ڕێکخراوو دەزگاکاندا هەمان بابەتن و دوبارە دەبنەوە؟

وەڵامی ئەوپرسیارە دەگەڕێتەوە بۆ ئەگەرێك لە تەنیشتیەوە ڕاستیەکیش هەیە کە بریتیەلە :

پێداویستیەکانی ڕاهێنان یەك شتەو بەهەمان جۆر دوبارەدەبێتەوە لە کاتێکدا پێویستە ئاگاداری ئەوەبین کە ئەو پێداویستیانە جۆراوجۆرەو هەمیشە لە گۆڕاندایە بەهۆی گۆڕانی بارودۆخەکان. شێوەکانی کارکردن یان چاکسازی کردن و ڕێککردنی یان نویٚ کردنەوە لە گۆڕانکاریە هونەریەکاندا هەروەها هاتنی فەرمانبەرانی نویٚ و بەرزکردنەوەی فەرمانبەرە کۆنەکان و زیادبونی ژمارەی فەرمانبەرە خاوەن بەهرەکان.

لەبەر ئەم هۆکارانە دیاریکردنی پێداویستیەکانی ڕاهێنان کارێکی بەردەوامەو پەیوەندیەکانیان وەك پەیوەندی هەمو کارێکی کارگێری وایە کە بەردەوام سیفاتەکانی پێویستی بە بەردەوامی و هەمەجۆرکردن هەیە.

کەواتە پێویست دەکات ئەم کارە زۆر بە وردی لێکۆڵینەوەو شیکردنەوەو تێڕوانین بۆ هەمو بارێك یان هەڵوێستێك بە جیاجیا بکات.

بۆ نمونە: لە پڕۆژە پیشەسازیەکاندا ڕاهێنانی ڕاستەوخۆ لە کاتی کارکردندا بەڕادەیەکی زۆر کاریگەریەکی زیاتری هەیە لە چاو ڕاهێنانکردن لە دەرەوەی کارەکەو پاش ڕاهێنان لە سەرکارەکە ڕۆڵی ڕاهێنانی دەرەکی دێت کە بە تەواوکەری ڕاهێنانە ڕاستەوخۆکە لە کاتی کارکردندا دێت.

سێیەم: تەنانەت لە کاتی دیاریکردنی پێداویستیەکانی ڕاهێنانەکەش بۆچی ڕاهێنانەکە ئەو پێداویستیانە ناگرێتە خۆی؟

وەڵامی سەرەکی بۆ ئەم پرسیارە بریتیە لە :

ئەو پێداویستیانەی دیاریدەکرێت بۆ ڕاهێنان بەشێوەی چەند ئامانجێکی دیاریکراو دانەنراوە کە ئەمەش شتێکی گرنگە چونکە دیاریکردنی ئامانجی ڕاهێنانەکە بەڕونی لە داڕشتنی کات و چەندێتی و جۆرێتیەوە گرنتی سەرکەوتنی ئەو هەولانە دەکات کە لە بەرنامەی ڕاهێنانەکەدا هەیە لە ڕێگەی نەخشەدانانی پرۆگرامەکەو دیاریکردنی بابەتەکان و هەڵبژاردنی ڕاهێنەرەکان و جێبەجێکردنی پرۆگرامەکە سپۆنسەرکردنی و هەڵسەنگاندنی ئاکامەکانی بەرەو گەیشتن بە ئامانج دەتبات.

چوارەم: کەم تەرخەمیەکی بەرچاوڕون هەیە لەو زانیاریانەی ڕاهێنانەکە پشتی پێ دەبەستێت لە هەندێك دەزگاکان.

ئایا دەبێت هۆی کەمتەرخەمی لە کۆکردنەوەی زانیاری تەواو بۆ ڕاهێنانەکە چی بێت؟

وەڵامەکەی لێرەدایە:

- کەموکورتی لە ڕێکخستنی زانیارییەکاندا.
- پشتگوێخستن لە بەکارهێنانی هۆکارە نوییەکان بۆ کۆکردنەوەی زانیاری پێویست.
- کەمی هۆشیاری و وریایی لێپرسراو یان بەڕێوەبەری خولەکە بۆ گرنگی ئەو زانیاریانەو سەرکەوتنیان.
- لەوانەیە زۆری زانیارییەکان و جۆراوجۆریان وای لە ڕاهێنەرەکە کردبێت نەتوانێت هەموویان کۆبکاتەوەو ڕێکیان بخات.
- هاوکاری نەکردنی ئەو فەرمانبەرەی هەڵدەستێت بە ئەنجامدانی ئەوکارە (واتە کۆکردنەوەی زانیاری تەواو لەسەرخولەکە) کە بەسەرچاوەیەکی گرنگ دادەنرێت بۆ دەستخستنی زانیاری پێویست و هەستان بە جێبەجێکردنی چالاکی ڕاهێنانەکە.
- لە ڕاستیدا ئەم کارە زۆر ئەرکێکی گرانە بەڵام جگە لەوە هۆکاری یارمەتیدەری زۆر هەن کە کاردەکەن بۆ سوکردنی ئەو.

## ئەرکە گرانە کردارەکانیش بریتین لە:

١) هەبونی چەند ڕێگایەکی زۆر بۆ کۆکردنەوەی زانیارییەکان کە هەندێکیان بە ئاسانی و خێرایی ناسراون.

٢)  زۆربـــەی زانیاریـــەکان لـــە سەرچـــاوە لقیەکانـــدا امصادرثانو...
دەستدەکەون لە دەرخستەو فایل و ڕاپۆرتەکان.

٣)  زۆر بە دەگمەن تەنها کەسێك بە تەنیا هەڵدەستێت بە ئەنجامد...
کاری کۆکردنەوەی زانیاریـەکان بۆیـە دەتوانرێت چەند کەسێك پێک...
ئەو کارە ئەنجام بدەن.

٤)  زۆربەی زانیاریـەکان کـاتی وا هەیـە بـۆ شـتێکی تـر بەسود نەب...
لەگەڵ دیاریکردنی پێداویستیەکانی ڕاهێنانەکـە ئەمـەش ئـەو کۆشش...
کـات و پاردیـە دەردەخـات کـە لـە کۆکردنـەوەی ئـەو زانیاریانـەدا خە...
کراوە.

٥)  لەوانەیـە هـەمو ئـەو زانیاریانـەی کۆکراوەتـەوە پێویست بـە پا...
جارنـەکات  بـەڵکو دەتوانرێـت لـە چـەند ئاستێکدا کۆبکرێتـەوەو پلا...
لێپرســراوی ڕاهێنانەکـــە دەتوانێـــت پۆلێنیـــان بکـــات بـــەپێی جۆ...
گرنگیەکەی و سەرنج بخاتە سەرگرنگترینیان پاشان گرنگتر.

پێنجەم: بۆچـی لـە کـاتی دیـاریکردنی پێداویستیەکانی ڕاهێنان هە...
ڕودەدات؟

بەشێوەیەك بەرپرسانی کارگێڕی بۆیان دەردەکەوێت ئـەو شتانەی ب...
پێویستی ڕاهێنانەکە زانراوەو ئامادەکراوە جیاوازە لەو شتانەی لە و...
پێویستن؟

بەکورتی وەڵامەکەی لێرەدایە:

بێتوانایی لە جیاکردنەوەی کێشەی ڕاهێنانەکە و کێشەکانی تر کێشەی ڕاهێنان ئەتوانرێت لە ڕێگەی ڕاهێنان پێکردنەوە چارەسەربکرێت بەڵام کێشەکانی تر بە چەند ڕێگاو شێوازێك دەتوانرێت چارەسەر بکرێت کە هیچ پەیوەندییەکی بە ڕاهێنانەوە نیە.

بە پێچەوانەوە لەوانەیە ڕاهێنان زیانیان زیاتر لە قازانج پێبگەیەنێت.

دەبێت ڕاهێنان چ سودێکی هەبێت بۆ فەرمانبەرێك کێشەی نەگونجانی کارەکەی هەیە لەگەڵ تواناو حەزەکانی ئەودا؟

چارەسەرکردنی کێشەی ئەو فەرمانبەرە لەوەدایە بیخەیتە سەر ئەوکارەی دەگونجێت لەگەڵ حەزەکانیدا پێش ڕاهێنان پێکردنی!

لەوانەیە کێشەی کارگەیەك لە کەمی بەرهەم هێناندا هۆکارەکەی بگەڕێتەوە بۆ کەمی پاداشتی کرێکارەکان نەك کەمی شارەزایان بۆیە چارەسەرکردنی کێشەکە لە چاکردنی باری دارایی کرێکارەکاندایە نەك ڕاهێان پێکردنیان!

لەبەرئەوە دەبێت زۆر بەوردی جیاوازی بکەین لە نێوان ئەو کارو ساتانەی لە ڕێگەی ڕاهێنانەوە چارەسەردەکرێت لەگەڵ ئەو کارو ساتانەی پێویستیان بە چارەسەرکردن هەیە لە ڕێگەی تر جیاواز لە ڕاهێنان!

شەشەم: بۆچی هەندێك لە تاکەکان سەرەڕای گرنگیدان بە گەشەکردنی ئاستیان و بەهێزکردنی تواناکانیان گرنگی بە پرۆگرامەکانی ڕاهێنانەکە نادەن؟

وەڵامەکەشی ئەمەیە:

لەبەرئەوەی تاکەکان باوەڕیان بەوە نیە ئەو پرۆگرامی ڕاهێنانە
بۆیان پێشکەش دەکرێت پێداویستیەکانیان بۆ پڕبکاتەوە چونکە
قەناعەتی ئەوان بەرپرسەکانیان لە کاتی داڕشتنی بەرنامە
ڕاهێنانەکەدا پرسیان پێنەکردون چیان پێویستە بۆ ئەوەی ڕاهێنان
لەسەربکەن؟ تەنانەت گوێیان بۆ پێشنیارەکانیشیان نەگرتوە!

تێنەگەیشتنی تاکەکان لە گۆڕینی ڕەفتارو بیرکردنەوەیان بۆ
بەشداری کردنیان لەو ڕاهێنانەدا هۆکارێکی ترە بۆ ئەوەی گرنگی
ڕاهێنانەکە نەدەن!!

کەواتە ئێمە پێویستیەکی زۆرمان هەیە بە هاندانی تاکەکان بۆ
بەشداریکردنیان لە ڕاهێنانەکاندا چونکە ئەوە بەیەکێک لە بنە
سەرەکیەکانی ڕاهێنان دادەنرێت کە یارمەتیدەرێکی باش دەبێت
گۆڕینی ڕەفتاری تاکەکان بەو ئاراستەیەی بەرەو زیادبونی بەشداربون
بەدی هێنانێکی ئەرێنی بۆ ئامانجەکانی ئەو ڕاهێنانەی دەزگاکە یان
ڕێکخراوەکە بۆیانی دەکات.

حەوتەم: بۆچی زۆربەی کات ڕاهێنانەکان شوێنەوارێکی بەهێز
پێوە دەردەکەوێت لە ڕوی گەشەپێکردنی ئاستی کارامەیی و ڕەفتار
باشکردنی کرداری تاکەکان لە کاتێکدا باشترین ئاستە لە زیادکردن
تاکەکان لە ڕوی زانیاریەوە؟

وەڵامی ئەم پرسیارەش لێرەدایە:

لەبەرنـەوەی تێگەیشـتنی لێپرسـراوی کـارگێڕی فەرمانگەکـە یـان ڕێکخراوەکە یان کۆمپانیاکـە بـۆ واتـای ڕاهێنـان لـە دیـدو بۆچونی ئـەودا بریتیـە لـەو بیرۆکانـەی کـە ئـەوان دەیانـەوێت کـرداری لەگەڵـدا بکـەن، ئەمەش لە خۆیدا بۆچونێکی هەڵەیە چونکە واتای ڕاستەقینەی ڕاهێنـان ئەو کردارە ڕێکخـراوە بەردەوامـەی تـاك دەگرێتـەوە لـە هـەمو بوارەکـانی ژیانیدا ﴿کەسایەتییەکەی – ئاراسـتەکانی – هەڵسوکەوت و ڕەفتارەکـانی ئاستی زانینی ..... هتد﴾، ئامانجیشی ئەنجامـدانی هەنـدێك گۆڕانکاری دیـاریکراوە کـە بـریتین لـە ﴿ڕەفتـاری – هونـەری – بـیرو ژیـری﴾ بـۆ بـەهێزکردنی ئـەو بوارانـەی کـە لـە ئێسـتادا یـان لـە داهـاتودا تاکەکـە پێویستی پێیەتی یان ئەو کارەی پێی ڕادەسپێردرێت پێویستی بـەو ڕاهێنانـە هەیە.

ئەمانـەش هـەمویان لـە کۆتایـدا سـودێکی باشـیان دەبێـت بـۆ تـاك و کۆمپانیاکـەش و یارمـەتی دەرێکـی باشیشـن بـۆ زیـادکردنی بەرهەمـەکانیان و گەشەپێکردنی کۆمەڵگا.

تێڕوانینمان بۆ ڕاهێنان دەبێت تێڕوانینێکی ڕێکخراوەیی ﴿یاسایی﴾ بێت چونکە ڕاهێنان لە خۆیدا بریتیە لە چەند بەشێکی ڕێکوپێك لـە یاسا لـەناو خۆیاندا یەکتری دەگرنەوەو کاریگەری دەکەنە سەریەکتر.

هەروەها پێکدێت لـە گوزەر(مـدخل)و کـردارو دەرەچـە (مخـرج) خزمـەتی چەند ئامانجێکی دیاریکراو دەکات کە لە ژینگەیەکی دیاریکراودا بونی هەبێت ناوەکیە ﴿کۆمپانیاکە یان دەزگاکە﴾ لە ناوخۆیدا.

یـان دەرەکیـە «کۆمـەڵگا» کارامـە دەبێـت لـە گەڵیـداو کاریگـەری دەبێت

گاریگەریشی دەکرێتە سەر.

کەواتە تێگەیشتنی ڕاستەقینەو دروست بۆ ڕاهێنان لای کارگێڕی دەبێت بە شێوەی کارێکی ڕێکخراوو کۆمـەڵی بێت واتـە کۆمەڵـە کارێکی ڕێکوپێک بە بەشداریکردنی سەرۆکی دەزگا یان فەرمانگە یان ڕێکخراوەکە لەگەڵ دەستە کارگێڕی و بەڕاوێژکردن بە ئەو کەسانەی بەشداری ڕاهێنانەکە دەکەن پلانی بۆ دادەنرێت بۆ زیاتر پێشخستنی کارو چالاکیەکان و بەرزکردنـەوەی ئاستی کارامەیی و زانستی تاکەکان لە هەمو بوارەکاندا.

بابەتی سێیەم

# ڕێگاکانی ڕاهێنان

نوسین وئامادەکردنی

م:صلاح الدين جيلح

# پێشەکی

ڕاهێنان بریتیە لە کرداری دەوڵەمەندکردنی تاکەکان یان کۆمەڵەکان
بە زانیاری و شارەزایی و کارامەیی لە ڕێگاکانی ئەداو سلوك تا ڕادەی
ئەوەی ئەو تاکانە یان کۆمەڵانە توانای هەستان بە ڕاپەڕاندنی
کارەکانیان هەبێت.

بۆ ئەوەی بە ڕاهێنان بگەینە ئاستی داواکراو پێویستە گرنگی بە
زانینی ڕێگاکانی ڕاهێنان بدرێت کە بەهۆیەوە دەتوانین بگەینە ئەو
ئامانجانەی نەخشەی بۆ کێشراوەو ئامانجەکانیش تەنها نوسین لە سەر
کاغەز نامێنێتەوە.

پشت بە خوا لەم بابەتەدا شارەزای گرنگترین ڕێگاکانی ڕاهێنان لە
جیهانی ڕاهێناندا دەبیت.

سەرەتا بابێین تیشك بخەینە سەر تێگەیشتن لە ڕێگاکانی ڕاهێنان و
ئەو پێوەرانەی ڕێگای ڕاهێنانی پێ هەڵدەبژێردرێت سەرەڕای
نمایشکردنی گرنگترین ڕێگاکان بۆ ناسینی ڕاهێنان و کەی بتوانین
بەکاری بهێنین لەگەڵ جیاکردنەوەکان و عەیبەکانی.

لە کۆتایشدا باس لە هەڵسەنگاندن بە هەر چوار ئاستەکەیەوە دەکەین.

## پێناسەی ڕێگاکانی ڕاهێنان :

دەتوانین ڕێگاکانی ڕاهێنان پێناسە بکەین بەوەی ئەو شێوازانەیە کە ڕێنمایی کاردەکەن و جێبەجێکردنی ڕاهێنانەکە ڕێکدەخەن بۆ گەیشتن بەچەند ئامانجێکی دیاریکراو.

## بنچینەکانی (پێوانەکان) هەڵبژاردنی ڕێگاکانی ڕاهێنان:

بۆ دیاریکردنی ڕێگاکانی ڕاهێنان کۆمەڵە بنچینەیەك هەیە لەوانە :

١. لێهاتویی ڕاهێنەر
٢. شوێنی ڕاهێنان
٣. کاتی تەرخان کراو
٤. ئامانجەکانی کارخانەکە
٥. بابەتە لقیەکان
٦. توانای ڕاهێنراوەکان
٧. دابینکردنی پێداویستیەکان
٨. ژمارەی ڕاهێنراوەکان

## گرنگترین ڕێگاکانی ڕاهێنان

### یەکەم : وانەبێژی ﴿المحاضرة﴾

پێناسەکەی: **گفتوگۆیەکی نیمچە فەرمیە** پێکدێت لە زنجیرە ڕوداوێك یان ڕاستیەك یان تێگەیشتنی کۆمەڵە بنەمایەك ڕاهێنەر هەڵدەستێت بە باسکردنی.

یان بریتیە لە گەڕان و باسکردن لە کێشەیەك یان ڕونکردنەوەی پەیوەندیەکان.

## کەی وانەبێژی بەکاردێت : لە کاتی

١- ناساندنی ڕاهێنراوەکان بە بنچینە بیردۆزیەکانی بابەتەکە.

٢- پێدانی ڕێنمایی دەربارەی کارە ڕاپەڕێنراوەکان کە لە کاتی ئەنجامدانی چالاکیەکانی داهاتودا بەکاردێن.

٣- ڕونکردنەوەی چۆنیەتی جێبەجێکردنی بنەماکان یان بنچینەکان یان تێگەیشتنەکان.

٤- پێداچونەوە یان کورتکردنەوە یان ڕونکردنەوە یان دوپاتکردنەوە.

٥- زۆری ژمارەی ئامادەبوان.

٦- ماوەی قسەکردن یان ڕونکردنەوە کورتە.

## جیاکەرەوەکان ﴿المزایا﴾

١- نەبەسترێتەوە بە کات و شوێنێکی دیاریکراو.

٢- نەبەسترێتەوە بە ژمارەیەکی دیاریکراو.

٣- لەگەڵ پێداویستیەکانی تردا بەکاربهێنرێت.

٤- ڕەچاوی جیاوازی ئاستی فێرخوازان بکرێت.

## عەیبەکان (خەوش):

١- قورساییەکە بە تەنها بکەوێتە سەرشانی ڕاهێنەرەکە.

٢- ڕۆڵی ڕاهێنراوەکان تەنها گوێگرتن بێت.

٣- نەگۆڕینەوەی بیرو بۆچونەکان لە نێوان ڕاهێنەرو ڕاهێنراوەکاندا.

٤- بابەتەکە گونجاو نەبێت بۆ وانەبێژی کارامەکان.

## دووەم : نواندنی ڕۆڵەکان

ڕێگایـەکی کرداریـە بـۆ ڕاهێنـان نوانـدنێکی خۆڕسکە (تلقـائی) بـۆ هەڵوێستێك لە خۆی دەگرێت بە ڕێنمایکردنی ڕاهێنەر لە ڕێگای دوکەس یان زیاتر جێبەجێدەکرێت.

### کەی بەکاردێت ؟

دەتوانرێت ڕێگای نواندنی ڕێگاکان لە کاتی هەڵوێستێکی ڕاهێنانـدا کە کاریگەری نێوان دوکەس یان زیاتـر لەخۆدەگرێت بەکاربهێنرێت.

### جیاکەرەوەکانی

١- هەستکردن بە واتای ڕۆڵەکان (ادوار).

٢- دەرخستنی شێوازی نوێ بۆ هەڵسوکەوت.

٣- سەرنج و لاسایکردنەوەی بەرامبەر.

٤- لە سەرەتاوە سەرنجی ڕاهێنراوەکان داگیربکات.

### عەیبەکان (ئاریشەکان)

١- ماوەکەی درێژخایەن بێت.

٢- لەوانەیە ڕاهێنراوەکان هەست بە دڵتەنگی بکەن ئەگەر زانیارییـەکان جیاواز بێت لەو ڕۆڵەی پێیان بەخشراوە.

٣- نەگونجاندنی ڕۆڵەکان لە زوربەی کاتدا.

## سێیەم : لێکۆڵینەوە لە بارەکە (دراسە الحالە)

بریتیە لە بەشداری پێکردنی ڕاهێنراوەکان لە کرداری ڕاهێنانەکەدا بە شێوەیەك ڕاهێنەر کێشەیەك یان دیاردەیەکی واقعی کە لە کۆمەڵگا بلاّوە دەخاتە بەردەستیان و داوایان لێدەکات پێکەوە بەشداری بکەن لە لێکۆڵینەوەو گەیشتن بە چارەسەری گونجاو بۆیان لەگەڵ باسکردنی لایەنی ئەرێنی و نەرێنی و پێشنیارو وەسیەتەکان بۆ ئەو بابەتەی خراوەتە بەردەستیان.

### کەی بەکاردێت؟ لە کاتی

١- گەشە پێکردنی تواناکان لە موناقەشەکردنێکی قوڵ بۆ هەڵوێستەکە.

٢- گەشە پێکردنی توانا لەسەربڕیاردان لەسەر شتەکان واتە چارەسەرکردنی کێشەکان.

٣- بەرهەم هێنانی بنەماکانی کارگێڕی.

٤- گەشە پێدانی کارامەیی لە پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان.

### جیاکەرەوەکان

١. بەشداری پێکردنی فێرخوازان.

٢. واقعی حاڵەتەکە.

٣. بینینی لایەنەکانی کێشەکە.

٤. بیرکردنەوەیەکی ڕێکوپێك.

٥. پارێزگاریکردن لە سەرنج ڕاکێشانەوە (الترکیز).

٦. خۆش و سەرنج ڕاکێش بێت.

عەیبەکان

١. کاتێکی زۆر. - ژمارەیەکی کەم.

٢. نمونەیی لە چارەسەرەکاندا.

٣. چارەسەرەکان بابەتی نەبن.

٤. بەسوك سەیرکردنی حاڵەتەکە.

٥. پێویست بە سەرنجێکی بەرزدەکات.

## چوارەم: وروژاندنی بابەتەکە ﴿العصف الذهني﴾

## ڕێگای وروژاندنی مێشک

١- پرسیارێك ئاراستەی کۆمەڵێکی بچوك دەکات سەبارەت بە چۆنیەتی هەڵ وکەوت لە کاتی ڕودانی ڕوداوێك یان کێشەیەك.

٢- داوایان لێدەکرێت بگەڕێن بەدوای زۆرترین چارەسەر کە لە توانایاندا هەبێت.

٣- هاندانیان بۆ یەکگرتنی بیرۆکەکانیان و ڕادەربڕین لە نێوان یەکتریدا.

٤- بیرۆکەکان لەسەر تابلۆیەك بنوسرێتەوە بەخێرایی ئەوکاتەی کە بیرۆکەکان دەردەچن.

## کەی بەکاردێت ؟

ڕێگای وروژاندنی بیرۆکەکان بەکاردێت بۆ گەشە پێکردنی بیرۆکەو چارەسەرە نوێیەکان یان داهێنراوەکان بۆ کێشەکان و هەروەها گەشەپێکردنی تواناکان لە داهێناندا و هاندانی ڕاهێنراوەکان بۆ بەشداریکردن.

### جیاکەرەوەکان

یارمەتی داهێنانی بیرۆکەی نوێیە ئەگەر ڕێژەکەشی ١٠٪ تێپەڕنەکات.

### عەیبەکان

١- پێویستی بەسەرکردەیەکە بۆ گروپەکە.

٢- دڵنیابون لە تێگەیشتنی تەواوی بەشداربوان بۆ بیرۆکە سەرەکییەکەو دەرنەچونیان لە ئامانجەکە.

## پێنجەم : گروپی گفتوگۆ

لەم ڕێگەیەدا کۆمەڵێك بەشداربوان کە ژمارەیان لە (٣ بۆ ١٠) کەس پێکدێت لە ژێرچاودێری و ڕێنمایی سەرۆکی تیپەکەدا هەڵدەستن بە پێشکەشکردنی بۆچونەکانیان سەبارەت بە کێشەیەك یان بابەتێك بە شێوەی چەند خاڵێکی دیاریکراو بۆ بابەتێکی فراوان.

### کەی بەکاردێت ؟ لە کاتی

١- دیاریکردن یان وەرگرتنی بۆچونەکان و پێشکەشکردنی سەبارەت بە بابەتێك کە هێشتا نەگەیشتونەتە ئەنجام تیایداو یەکلانەبوەتەوە.

٢- دیاریکردن و ڕونکردنەوەی جیاکەرەوەکان و عەیبەکان (المزايا والعیوب) کە پەیوەستن بە کۆمەڵێك ڕێنماییەوە.

٣- سودوەرگرتن لە شارەزایی و زانیاری و پسپۆڕیەکان.

٤- وروژاندن و گرنگیدان بە بابەتێکی دیاریکراو.

## جیاکەرەوەکان

١- ڕێگەدان بە بەشداریکردن لەگەڵ کۆمەڵە گەورەکان بۆ ئەو بابەتانەی کە بە ڕێگاکانی تر چارەسەرناکرێت.

٢- ڕێگایەکی خۆشە بۆ ڕاهێنان.

٣- گۆڕانکاریش دەکات لە پرۆگرامەکانی ڕاهێنانەکەدا.

## عەیبەکان

١- بەبێ پێشەوایەکی شارەزا سود وەرناگیرێت لە ڕاهێنانەکە.

٢- لاوازی توانای سەرکردەکە لە چۆنیەتی هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ بەشداربوان.

٣- لاوازی سەرکردەی گروپەکە لە هاندانی ڕاهێنراوەکان بۆ بەشداریکردن.

٤- پێویستی بەکاتێکی زۆرە.

## شەشەم : چارەسەرکردنی کێشەکان

بریتیە لەچەند کردار یان هەنگاوێك کەسی ڕاهێنراو پێی هەڵدەستێت بەپێی ئەو زانیاری و شارەزایەی پەیدایکردوە لە ئەنجامی بەشدارکردنی لە خولەکەدا بۆ زاڵبون بەسەر کێشەیەك و گەیشتن بە چارەسەری گونجاو پێی.

| | |
|---|---|
| دیاریکردنی کێشەکە | • پرسیارلەسەرکێشەی ناساندنی کێشەکە |
| شیکردنەوەی کێشەکە | • کۆکردنەوەی زانیاریەکان<br>• شیکردنەوەی هۆکارەکە |
| داهێنانی چارەسەرەکان | • پێشنیاروکۆکردنەوە<br>• بژارکردن |
| جێبەجێکردن | • بڕیاردان<br>• جێبەجێکردنی بڕیارەکان<br>• پلانی کۆڕدراو |

## جیاکەرەوەکان

١. سەرنجڕاکێش دەبێت.

٢. کارامەیی لە بیرکردنەوەدا بەدەستدەهێنیت.

٣. بەنەرمونیانی ناسراوە.

٤. بەکارهێنانی ڕوداوەکانی ڕۆژانە.

٥. متمانە بەخۆبون.

٦. سەرچاوەی زۆرت دەبێت بۆ چارەسەرەکان.

### عەیبەکان

١. لەوانەیە توشی بێتاقەتیت بکات.

٢. پێویستی بەکاتێکی درێژە.

٣. لەوانەیە پێویستی بە کۆمەڵێک پێداویستی هەبێت دەستنەکەون.

٤. پێویستی بە سەرنج و تێبینیەکی زۆر وردو بەردەوام هەیە.

# بابەتی چوارەم

# هەڵسەنگاندنی ڕاهێنانەکە

## نوسین وئامادەکردنی

## د.عبدالله هنانو

ئەم خشتەیە بیردۆزی ﴿کیریك باتریك﴾ە بۆ هەڵسەنگانی زانین و بەکارهێنانی ناوەڕۆکەکەی و نمونە لەسەر پێداویستیەکان و شێوازەکانی ڕاهێنان.

| ئاستی یەك (١) | جۆری هەڵسەنگاندن کاردانەوەکان |
|---|---|
| وەسف و تایبەتیەکانی ڕاهێنان. | هەڵسەنگاندنی کاردانەوەکان لە ڕێگەی زانینی هەستی ڕاهێنراوەکان دەکرێت بەرامبەر بە ڕاهێنانەکە یان فێربون بۆ نموونە:<br>- ئایا ڕاهێنراوەکان حەزیان لە ڕاهێنانەکە کردو پێی دڵخۆش بون؟<br>- ئایا ڕاهێنانەکەیان بە پەیوەندی بە باتەکەوە دانا؟<br>- ئایا کاتێکی بەسودیان بردە سەر لەگەڵی؟<br>- ئایا شوێن و شێوازو کاتی ڕاهێنانەکەیان بەدڵ بو؟<br>- ئاستی بەشداریکردن<br>- دڵنیایی بون بە تاقیکردنەوەکە.<br>- تێکۆشانی داواکراو بۆ سودمەند بون لە فێربون.<br>- ئەو توانایانەی دیارە بۆ جێبەجێکردنی |

| | |
|---|---|
| | کرداری بۆ فێربون. |
| نمونە بۆ پێداویستی و شێوازەکانی فێربون. | - نمونەیی : خشتەی بەختەوەری<br>- فۆڕمی (تغذیة راجعة) سەبارەت بە کاردانەوەی کەسێتی لەسەر تاقیکرنەوەکانی ڕاهێنان.<br>- کاردانەوەی زارەکی بتوانرێت بنوسرێتەوە و شیبکرێتەوە.<br>- هەڵسەنگاندن یان بەخشینی نیشانە لەلایەن ڕاهێنراوەکانەوە بۆ پەیوەندی لە ڕێگای ئەنتەرنێتەوە.<br>- بەخشینی رأپۆرت بە لێپرسراوەکان لەسەرئاستی بەشداربوان پاش گەڕانەوەیان بۆ فەرمانگەکەیان |
| پەیوەندی بە بابەتەکەوەو ئاستی کرداری. | - دەتوانرێت ڕاستەوخۆ دوای تەواوبونی ڕاهێنانەکە جێبەجێبکرێت.<br>- زۆرگرنگە بزانین کە خەڵکەکە هەستیان بە بێزاری نەکردوە.<br>- دەستکەوتنی (تغذیةراجعة) و کاردانەوە زۆرئاسانە. |

| ئاستی ٢ | جۆری هەڵسەنگاندن |
| --- | --- |
| | فێربون |
| وەسف و خاسیەتەکانی هەڵسەنگاندن | - هەڵسەنگاندنی فێربون پێوەری زیادبونە لە زانین پێش و پاشیش.<br>- ئایا ڕاهێنراوەکان فێری ئەو شتانە بون کە مەبەست بولێی؟<br>- ئایا ڕاهێنراوەکان ئەو شتانەیان تاقیکردەوە کە مەبەست بو تاقی بکەنەوە.<br>- ئاستی ئەوگۆڕانکاری و پێشکەوتنانە چەندە کە ڕاهێنراو پێش ڕاهێنان و پاش ڕاهێنان فێری بوە. |
| نمونە بۆ پێداویستی و شێوازەکانی هەڵسەنگاندن | - هەڵسەنگاندن و تاقیکردنەوە لەلایەن ڕاهێنراوەوە دەکرێت بۆ بەشداربوان لە پێش و لە پاش ڕاهێنان بە شێوەی نمونەیی.<br>- سەرەڕای ئەوەی کاتێکی زۆریش دەگرێت بەلام دەتوانرێت ڕێگەی چاوپێکەوتن یان نوسینی تێبینی لە پێش و لە پاش ڕاهێنانەکە بەکاربهێنرێت.<br>- دەبێت شێوازەکانی هەڵسەنگاندن پەیوەندییەکی پتەوی هەبێت بە |

| | |
|---|---|
| | ئامانجەکانی فێربون.<br>- پێوانـەکردن و شـیکردنەوە دەتوانرێت و ئاسانە لە ڕێگەی گروپەکانەوە.<br>- پێویسـتە نمـرەو پێـوەری ڕاسـتەقینە دابنرێت بۆ ڕاهێنراوەکان بۆ سنوردانان لە ترسـی ئـەوەی نەکەونـە هەڵـەوە لـە کاتی هەڵسەنگاندنەکە.<br>- هـەمو چـاوپێکەوتنەکان ڕێپێـدراوە لـە ڕێگــەی ئەنتــەرنێت و نوســین و چاوپێکەوتنی ڕاستەوخۆوە. |

وەسف و خاسیەتەکانی هەڵسەنگاندن

- هەڵسـەنگاندنی هەڵسوکەوت لـە ڕێگـەی پێـوەرکردنی ئاسـتی جێبـەجێکردنی فێربـون لـە کـاتی کارکردنـدا, دەتوانرێـت ئەو هەڵسـەنگاندنە ڕاسـتەوخۆ دوابخرێـت بـۆ دوای ڕاهێنانەکە یان دوای چوار مانگێك بەپێی حاڵەتەکە
- ئایا ڕاهێنراوەکـان پاش گەڕانـەوەیان لە ڕاهێنـان ئـەوەی فێری بون بەکرداری جێ بەجێیان کردوە؟
- ئایا ئەو زانیاری و کارامەیەی فێری بون بەکاریان هێناوە؟
- ئایا گۆڕانکاریەکی دیاری کراو بەڕاهێنراوەکەوە دەرکەوتووە لە

چالاكی و ئەدای ڕۆژانەی؟

- ئایا گۆڕنكارییەكان لە هەڵسوكەوت و فێربونی ڕاهێنراوەكەدا بەردەوامە؟

- ئایا ڕاهێنراو لە توانایدا هەیە ئەوەی فێری بوە باسی بكات بۆ خەڵكی؟

- ئایا ڕاهێنراو هەست بەو گۆڕانكاریانە دەكات كە تێیدا ڕویداوە لە ئاستی زانیاری و كارامەیدا؟

| | |
|---|---|
| نمونە بۆ پێداویستی و شێوازەكانی هەڵسەنگاندن | - پێویستی بەتێبینی و چاوپێكەوتن هەیە بەدرێژایی ماوەكە لە پێناو هەڵسەنگاندنی گۆڕانكارییەكە و بەردەوام بونی.<br>- كردارەكانی هەڵسەنگاندن بە شێوەیەكی خێرا متمانەی پێناكرێت چونكە كەسەكان بە جیاوازی كاتەكان بە ڕێگای جیاواز دەگۆڕدرێن.<br>- دەتوانرێت كردارەكانی هەڵسەنگاندن لە شێوەی سیناریۆ بكرێت بۆ ڕاهێنراوەكان بەپێی ئەو بابەتەی خوێندویەتی و چەند پێوانەیەكی دیاریكراوی بۆ دانرابێت.<br>- لە وانەیە هەڵسەنگاندنی خۆیی سودی هەبێت ئەویش بە بەكارهێنانی كۆمەڵێك پێوانە كە بەوردی نەخشەی بۆ كێشرابێت.<br>- بۆچونی ڕاهێنراوەكە ئەمەش ئاماژەیەكی |

| | |
|---|---|
| | زۆرگرنگە ئەویش خۆییە و متمانەی زۆری نیە بۆیە پێویستە بە ڕێگەیەکی پتەوو دیاریکراو پێوانەبکرێت.<br>- پێویستە کردارەکانی هەڵسەنگاندن دوربێت لە شێوەی لێپرسینەوە و دادگایکردن چونکە ئەوە هۆکارێکە بۆ شڵەژاندنی بیری ڕاهێنراو کاریگەریشی دەبێت لەسەر کرداری هەڵسەنگاندنەکە. |
| پەیوەندی بە بابەتەکەوە و ئاستی کردارێتی | - پێوانەکردنی گۆڕینی هەڵسوکەوت بە هێندو شیکردنەوەی زۆر قورسترە لە پێوانەکردنی کاردانەوەو فێربون.<br>- سیستەمی وەڵامدانەوەی ئاسان و خێرا بەس نیە بۆ هەڵسەنگاندن.<br>- کارامەیی و هاوکاری کردنی چاودێرەکان بە تایبەتی بەڕێوەبەرە بەرپرسەکان دو کاریگەری گرنگن بەڵام کۆنترۆڵ کردنیان کارێکی قورسە.<br>- بەڕێوەبردن و شیکردنەوەی کردارەکانی هەڵسەنگاندن کارێکی ئەستەمە ئەگەر بەسیستەمێکی باشی نەخشەدانراوو نوێ نەبێت. |

| | |
|---|---|
| - هەڵسەنگاندنی جێبەجێکردنەکان بە شێوەی کرداری زۆر گرنگە چونکە سودی چیە ئەگەر ڕاهێنراو دوای تەواوبونی خولەکە لە کاتی گەڕانەوەی بۆ سەر کارەکەی هیچ کاریگەریەکی نەبێت بۆیە هەڵسەنگاندن لەو بوارەدا بە کاریگەرترین ڕێگا دادەنرێت ئەگەر جێگەی ململانێش بێت. | |

- هەڵسەنگاندنی گۆڕینی هەڵس وکەوت ئاساییە ئەگەر لەلایەن بەڕێوەبەر و لێپرسراوان یان ڕاهێنراوەکانەوە پشتگیری و گرنگی پێدرا بۆیە گرنگە کە لە سەرەتاوە بخرێنە ناو بابەتەکەوە و سوودەکانی ئەو جۆرە هەڵسەنگاندنەیان پێ بناسێنرێت.
- هەڵسەنگاندنی ئاکامەکان لە ڕێگەی پێوانەکردنی ئاستی کاریگەری ئەدای ڕاهێنراوەکە دەکرێت بۆ بەرامبەرەکان و چواردەورەکەی (ئەوەش تاقیکردنەوەیەکی دڕندانەیە).
- بەشێوەیەکی نموونەیی پێوانەی ئەو نیشانە سەرەکیانە لە ئەدای ڕاهێنراو دەکرێت لە کارەکەی یان دەزگاکەی وەك

﴿بارستاییەکان ,بەهاکان , ڕێژەی سەدی , پێوانەکانی سەردەم لەو قازانجانەی لە ڕێگەی وەبەرهێنان و شتەکانی ترەوە دەتوانرێت بە شێوەی هێندەیی لە ئاستی ئەدای دەزگایدا دیاری بکرێت﴾ بۆ نمونە ﴿ئامادەکردنی سکالاّ, جوڵەی ئەندامانی کرێکارەکان, خۆخواردن حاڵەتی سەرنەکەوتن, بەفیڕۆدان, پاپەندنەبون, گەشەکردن, توانای پارێزگاری کردن, بەدیهێنانی بنچینە پێوانەییەکان و بەدەستهێنانی مارکە باوەڕپێکراوەکانە﴾.

| ئاستی٣ | جۆری هەڵسەنگاندن ئاکامەکان |
|---|---|
| وەصف وخاسیەتەکانی هەڵسەنگاندن | - هەڵسەنگاندنی گۆڕینی هەڵس وکەوت ئاساییە ئەگەر لەلایەن بەڕێوەبەرو لێپرسراوان یان ڕاهێنراوەکانەوە پشتگیری و گرنگی پێدرا بۆیە گرنگە کە لە سەرەتاوە بخرێنە ناو بابەتەکەوە و سودەکانی ئەو جۆرە هەڵسەنگاندنەیان پێ بناسێنرێت. |
| نمونەبۆ پێداویستی و شێوازەکانی هەڵسەنگاندن | - لەوانەیە زۆرینەی ئەو پێوانانە پێشتر بونیان هەبوبێت لە ڕێگای ڕێکخراوو دەزگاکانی تایبەت بە کارگێڕی و ڕێکخستنی ڕاپۆرتەکان. - دەتوانرێت ململانێ بکرێت لە دیاریکردنی کام لەو شتانە پەیوەندی هەیە بە موداخەلەکان و |

| | |
|---|---|
| | کاریگەرییەکان لەلایەن ڕاهێنراوو چۆنیەتی ئەو شتە.<br>- گرنگە لە سەرەتای ڕاهێنانەکەوە ڕێککەوتن لەگەڵ ڕاهێنراو بکرێت لەسەر دیاری کردنی بەرپرسیارێتیەکان و کارە گرنگەکان بۆ ئەوەی ڕاهێنراو تێبگات لەوەی چی دەخرێتە ژێر پێوانەوە .<br>- ئەم کردارە پەردەپۆش دەکرێت بە مەشق کردن لە بەڕێوەبردنی کارگێڕی ئاسایی، زۆر بەئاسانی پێویستی تەنها بە پەیوەندی هەیە لەگەڵ بابەتەکانی ڕاهێنان.<br>- سەرنەکەوتن لە بەستنەوە بە جۆروکاتی بابەتەکانی ڕاهێنان وا دەکات کارەکە زۆر قورستر بێت لە ئاکامەکان بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی ڕاهێنان.<br>- ڕاهێنان پێکردنی کەسە بەناوبانگەکان بەتایبەتی هەڵسەنگاندنی ساڵانەو ڕێکەوتنی بەردەوام لەسەر مەبەستە سەرەکییەکان بۆ کارکردن ئەمانە هەمویان دەچنە ناو جەرگەی پێوانەی ئاکامەکانی ئەو کارانەی لە ڕاهێنانەوە وەرگیراوە . |
| پەیوەندی بەبابەتەکەوەو ئاستی کرداری | - هیچ گرانیەکی تایبەت نیە لە هەڵسەنگاندنی ئاکامەکان بە تەنهایی بەلام لە دەزگاکان بەتەواوی ئەوە ململانێیەکی زۆر گەورەتر دروست دەکات بەلایەنی کەمەوە بەهۆی پشت |

| | |
|---|---|
| | بەستن بە کارگێڕی بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ و دوبارەکردنەوەی ئەو سنورانەی هەمیشە لە گۆڕانکاریدایە لە هەیکەل و بەرپرسیارێتی و ڕۆڵەکان ئەمەش وادەکات کە کردارێك بونیات بنرێت دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆکارێکی ڕون. هەروەها چەندکردارێکی دەرەکی هەیە کە بۆ سنورێکی زۆر گەورە کاریگەری دەکاتە سەر ئەدای کار و دەزگاکەش کە دەبێتە هۆی ڕومالکردنی هۆکارە ڕاستییەکە بۆ ئاکامە باشەکان یان خراپەکان . |

لەو کاتەوەی ﴿کیرك باتریك﴾ ئەم خشتەیەی دانا خاوەنی هەندێك بیردۆزەکان وەك ﴿جاك فیلیبس﴾و تەنانەت ﴿کیرك باتریك﴾یش خۆی ئاماژەیان کردوە بۆ ئاستێکی پێنجەمی پێشبینی کراو بەدیاریکراوی ﴿داهاتەکانی وەبەرهێنان RIO ﴾ دەتوانرێت داهاتی وەبەرهێنانەکان بخرێتە ئاستی چوارەمی ﴿کیرك باتریك﴾ بۆ ئاکامەکان بۆ نمونە ناوەوەی ئاستی پێنجەم هیچ سودێکی نیە ئەگەر هەڵسەنگاندنەکە لەلایەن ﴿داهاتەکانی وەبەرهێنان﴾ دوچاری پشتگوێ خستن یان بیرچونەوە دەبێت لە کاتی گەڕانەوە بەئاسانی بۆ ئاستی ﴿ئاکامەکان﴾.

## بابەتی پێنجەم

# دروستکردنی پاکێجی ڕاهێنان

## ﴿تصميم الحقائب التدريبيه﴾

ئامادەکردن ونوسینی

## د.طلال الصغير

## بەرهەمەکانی ئەم ڕاهێنانە

لە کۆتایی ئەم بابەتەدا لەم پەڕتوکە پێشبینی دەکرێت ڕاهێنەر توانای جێبەجێکردنی ئەم کارانەی هەبێت :

١. پێناسەی پاکێجی ڕاهێنان و تەواو تێگەیشتن لە واتاکەی.

٢. ڕونکردنەوەی گرنگی پاکێجەکانی ڕاهێنان و سەرچاوە بنەڕەتیەکانی.

٣. دەرخستنی تێگەیشتنە سەرەکیەکانی پاکێجی ڕاهێنان.

٤. لێهاتویی لە زاڵبون بەسەر بنەما کارامەیەکان لە دانانی پاکێجی ڕاهێنان.

### پاکێجەکانی ڕاهێنان [الحقائب التدريبية] پێناسە و تێگەیشتنەکان:

#### پاکێجەکانی ڕاهێنان:

چەند زاراوەیەکی جیاواز هەیە هاوشێوەن بۆ واتای «پاکێجەکانی ڕاهێنان» لە دەزگاکانی رأهێناندا لە جیهان بەکاردەهێنرێن زۆربونی ئەو زاراوانەو جیاوازیان هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ فرەیی زاراوە ئینگلیزیەکان کە هەندێکیان زاراوەی «پاکێجی ڕاهێنان» و هەندێکی تریان زاراوەی «رزمەی ڕاهێنانی» بەکاردەهێنن.

ئەم جیاوازیانەش لە زاراوەکاندا هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازی وەرگێڕانەکان لە زاراوە ئینگلیزیەکاندا چونکە دەزگاکانی ڕاهێنان لە ولاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکادا چەند جۆرێك لە زاراوە بەکاردەهێنن.

هەنـــدێكیان زاراوەی ﴿paekage﴾و هەنـــدێكی تریـــان زاراوەی ﴿module﴾ و هەنـــدێكی تریشـــیان زاراوەی ﴿kit﴾ بـەكاردەهێنن سەرچاوەی جیـاوازیش لـە دەربـڕینی ئـەو زاراوانـەدا دەگەڕێتـەوە بـۆ جیاوازی دەزگاكانی ڕاهێنان لە سەرنج خستنە سەریەك لە لایەنەكانی پۆستی ڕاهێنان.

هەندێك لە زاراوەكان سەرنج دەخاتە سەر شێوەی دەرەكی پۆستەكە و هەنـدێكی تریـان سـەرنج دەخەنـە سـەر نـاوەڕۆكی پۆسـتەكان و جۆری كەرەسـە بـەكارهاتوەكان تیایـدا هەندێكیشـیان سـەرنج دەخەنـە سـەر شێوازی پرۆگرامەكان و ڕێكخستنی.

سەرەڕای زۆرینەی زاراوەكان لە كاتی باسكردن لە پاكێجەكانی ڕاهێنـان بەڵام هەموویان لە كۆمەڵێك بنەمادا یەك دەگرنەوە.

پاكێجـەكانی ڕاهێنـان بـریتین لـە كۆمەڵـە بیرۆكەیـەكی شـارەزایی لـە بواری ڕاهێنان.

كەسانی شارەزاو لێهاتو هەڵدەستن بە دانانی پرۆگرامەكانی ڕاهێنانەكە بە شێوەیەكی ڕێكوپێـك، پاشـان ئـەو پرۆگرامـە لەلایـەن ڕاهێنەرەكانـەوە لە شێوەی خولێـك بـە چـەند وانەیـەك بـە فێرخوازەكان دەوترێتـەوەو كـاتێكی دیـاریكراوی لەلایـەن سەرپەرشـتیاران یـان ڕاهێنەرەكانـەوە بـۆ دادەنرێت.

پاكێجـــەكانی ڕاهێنـــان پەیوەســـتن بـــە بابـــەتێكی دیـــاریكراوەوەو سەرچاوەكەشـــی بریتیـــە لـــە ﴿ ئامانجـــەكان، چـــالاكیەكان، كەرەســـەو شارەزایی ڕاهێنان و ڕۆژمێرەكان﴾.

ئەو پاکێجانەش ئامادەدەکرێن لە شێوەی بابەتی نوسراویی کە هاوپێچ لە گەڵیدا فلیمی ڤیدیۆیی تایبەت بە بابەتەکە نمایشدەکرێت و شیکردنەوەی حاڵەتەکان و نمایشکردنی شانۆیی بۆ ڕۆڵی جۆراوجۆر.

پۆستەکانی ڕاهێنان بە شێوەیەك لە شێوەکانی هونەری ڕاهێنان ئامادەدەکرێت کە پێشتر لە چەند خولێکی ڕاهێناندا لەلایەن کەسانی خاوەن ئەزمون و شارەزا وترابێتەوە و تاقیکرابێتەوە کە بابەتێکی کاریگەرە بۆ ڕاهێنان و بەتوانایەکی زۆر جیادەکرێتەوە لە پێشخستنی کارامەیی و ئاراستەکان لە لایەن ڕاهێنەرەکانەوە بە بەراورد لەگەڵ پرۆگرامە تەقلیدیەکانی تری ڕاهێنان.

بۆیە پاکێجی ڕاهێنان زاراوەیەکە هەمو زانینەکانی ڕاهێنان لە دوو کەرەسەو ئامێرەکان و تەکنیك و ستراتیژیەکان دەگرێتەوە کە نەخشەی بۆ کێشراوە بۆ پڕکردنەوەی ئەو پێداویستیانەی ڕاهێنراو پێویستی پێیەتی.

## گرنگی پاکێجەکانی ڕاهێنان

پاکێجەکانی ڕاهێنان گرنگیەکی گەورەی هەیە کە ڕەنگدەداتەوە لە هەمو ئەو کەسانەی پەیوەندیان بە پرۆگرامی ڕاهێنانەوە هەیە ئیتر ئەو کەسە ڕاهێنەر یان ڕاهێنراو یان کەسانی بەرپرس بێت لە ڕێکخستنی خولەکان چونکە ئەوانە دادەنرێن بە:

١. سەرچاوەیەکی باوەڕپێ کراوو مەنهەج (پرۆگرام) بۆ ڕاهێنەر و ڕاهێنراوەکەش.

٢. شـێوەیەکی ڕێکـوورد دەبەخشـێت بـە کاتـەکان و بەرنامـەکانی ڕاهێنانەکە بۆ ئـەوەی یارمـەتی دەربێت لـە پێکانی ئامـانج و پـەیامی ڕاهێنانەکە.

٣. ڕونکردنەوەی ناوەڕۆکی ڕاهێنانـەکەو شێوازە بـەکارهاتووەکان لـە کاتی جێبەجێکردنیدا.

٤. یارمـەتی دەرێکـی باشـە بـۆ ئامادەکاریـەکانی پێشـەکی بەرنامـەکانی ڕاهێنانەکە.

٥. یارمـەتی ڕاهێنـەرێکی سـەرەتا دەدات تـاکو ئەرکـەکانی ڕاهێنانەکە بە شێوەیەکی باش جێبەجێبکات.

٦. بەرچاوڕونیەك بـە ڕاهێنـەر دەبەخشـێت سـەبارەت بـە بابەتـەکانی ڕاهێنانەکە.

٧. ڕۆڵـی هەریـەکێك لـە بەشـداربوانی خولەکـە لـە ڕاهێنانەکـەدا ڕوندەکاتەوە «ڕاهێنـەرو ڕاهێنراو».

٨. ئاسانکاری لـە پێشخسـتن و گۆڕانکـاری لـە بابەتـەکانی ڕاهێنانەکـە و گۆڕینی بۆ بەرنامەیەکی ڕاهێنـان لـە شێوەی «powerpoint» دا بۆ ئەوەی زۆرترین کەس سودی لێوەربگرێت.

## پۆلێنکردنی پاکێجەکانی ڕاهێنان و جۆرەکانی

پاکێجەکانی ڕاهێنان چەند جۆرێك پۆلێنکردنی جیاوازی هەیە ئەویش بەپێی چەند بۆ چونێك لەوانە:

ئامادەکردنەکە:

١. بەپێی سەرچاوەی ئامادەکردن و ناوەڕۆکەکەی لە چەند پەرتوکێك

لەوانەیە سەرچاوەی ئامادەکردن و ناوەڕۆکەکەی لە چەند پەرتوکێك یان شارەزایی تەواو یان هەردووکیان بەیەکەوە (پەرتوك+ شارەزایی) سەری هەڵدابێت.

٢. بەپێی ڕێگاکانی ڕاهێنان :

لەوانەیە پۆستەکان لە ڕێگەی پەیوەندی ڕاستەوخۆ لە نێوان ڕاهێنەرو ڕاهێنراو یان لە ڕێگەی ئەنتەرنێتەوە (ئۆن لاین) بوبێت.

٣. بەپێی سەرچاوە دەستخستن :

لەوانەیە بەدەستخستنی پاکێجەکان لە ڕێگەی ئەنتەرنێتەوە بێت یان لە ڕێگەی پەیوەندی ڕاهێنەرەکە بەتەنها یان لە ڕێگەی پشتبەستن بە گروپێکەوە یان لە ڕێگەی کڕینی پاکێجەکە لەلایەن لایەنێکی پسپۆڕ بۆ ئامادەکردنی پۆستە متمانە پێکراوەکان.

٤. بەپێی ئاستەکان:

لەوانەیە پاکێجەکە بناغەیەك بێت بۆ چەند کارامەییەك یان چەند زانیاریەك یان چەند ئاراستەیەکی سیاسی لە کاتی جێبەجێکردنی کارەکەدا یان بناغە بێت بۆ دەرچون بەرەو ئاستێکی بەرزتر لە کارامەیی و زانیاری و ئەو ئاڕاستانەی لە پۆستەکاندا پێشکەشکراون یان چەند پاکێجێکی پێشکەوتوترن لە پاکێجە بنەڕەتیەکان لە کارامەیی و زانیاری و ئاراستەکان بۆیە دەبێت خاوەنداریێتی پۆستە بنەڕەتییەکان بێت لە کارامەیی و زانیاری پێش ئەوەی بچێتە ناو ئاستێکی پێشکەوتوترەوە.

### ٥: بەپێی بابەت و بوارەکان:

لەوانەیە پاکێجێك بێت لە بواری ﴿خێزانی یان کارگێڕی یان فێربون و پەروەردەیی یان دروستکردنی خود﴾ پێکهاتبێت.

### ٦: بەپێی جەماوەر:

لەوانەیـە گشـتی بێـت بـۆ هـەمو خـەڵکێك بگونجێـت. زۆر بەکـەمی گرنگـی بـە لایەنــە گشـتیەکان بـۆ پێگەیانـدنی خـود دەدرێـت بـەڵام تایبەتیـەکان ئەوانەیـە کـە گرنگـی بـە کارامەیـەکان دەدەن لـە بـواری کارکردن لـە دەزگـا یـان کۆمپانیایـەکی تایبـەت و دیاریکراو بـەپێی ئـەو جۆرو ئەرکانەی ڕاسپێردراوە بە ڕاهێنەر لەو لایەنەدا فێریان بکات.

### ٧: بەپێی شوێنی پاراستن یان پێداویستیەکانی نمایشکردن:

یان بۆ شتێکە لە شێوەی کۆمەڵە فایلێکە پارێزراوە لە کۆمپیوتـەردا یـان کۆمەڵـە فایلێکـە لەسـەر کاغـەز نوسـراوەتەوەو لـە شـێوەی فایلـدا پارێزراوە.

## هەیکەلی پاکێجەکانی ڕاهێنان

### پێک دێت لە چەند بەشێک:

1. بەشی کلیلی پۆستەکە:

ئەمە بەشێکە دەکەوێتە سەرەتای پاکێجەکەوەو ناوەڕۆکەکەی بریتیە لە ئەو سەرچاوانەی پەیوەنـدیان بـە نـاوەڕۆك و بەڵگەکانـەوە هەیـە لە

هەمان کاتدا وێنەیەکی گشتی و گشتگیری پرۆگرامەکە نیشاندەدات بە
هەمو سەرچاوەکانیەوە ئەم بەشە لەم سەرچاوانە پێکدێت:

- نمونەیەکی بەرگی پاکێجی بابەتەکە که پێکهاتوە لە ناوی بابەتی راهێنانەکەو پرۆگرامەکەو ناوی ئامادەکاری پاکێجەکەو ئەو سەرچاوە زانستیانەی بەکارهاتوەو ئەو کەسانەش کە هەستاون بەپێشخستنی پۆستەکەو ئامانجە گشتیەکەو دروشمی پۆستەکەو لۆگۆی تایبەت بە پاکێجەکە یان ڕێکخراوەکە ئەگەر هەبو.
- ناونیشانی یەکەکان و ناوەرۆکەکانی.
- پێرستی ناوەرۆکە سەرەکیەکان.

٢. بەشی ڕێبەری ڕاهێنەرەکە:

ڕێبەرێکی ڕێنماییە ڕاهێنەر پشتی پێدەبەستێت لە جێبەجێکردنی یەکەکان و دانیشتنی ڕاهێنانەکان کە یارمەتی دەرن لە ڕونکردنەوەی ڕۆڵی ڕاهێنەرو ڕاهێنراوو داواکانی جێبەجێکردنێکی زانستیانە بۆ ڕاهێنانەکە.

ڕێبەرەکەش پێکهاتوە لە:﴿ زاراوەی ناوەڕۆکەکە – دانیشتنەکانی ڕاهێنان – تەوەرەکان –ئامانجە گشتیەکان و بەشەکانی ڕاهێنان – ئامێرو کەرەستانەی بەکاردەهێنرێن – شێوازو ڕێگاکانی ڕاهێنان و ئەو کاتەی دەیخایەنێت﴾.

چەند هەنگاونانێك بۆ ڕونکردنەوەو نمایشکردنی بابەتی ڕاهێنانەکە وەك ﴿سەرنجڕاکێشان - نمایشکردنی ئامانجەکە - بیرخستنەوە

هەنگاوەکان و زانیاریەکانی پێشوتر- نمایشکردنی ناوەڕۆکی بابەتەکە - شێوازو ڕێنمایەکان ﴿پێشکەشکردنی ئاماژە﴾ - جێبەجێکردن ﴿مەشق پێکردن و نواندن﴾ ڕێکخستنی جێبەجێکردنەکان - گواستنەوەو پشتگیری﴾.

هەمویان پێچەوانەکردنەوەی ئەو بابەتانەن لە پۆستەکەدا هەیە.

## ٣. بەشی ڕێبەری ڕاهێنەر:

بریتیە لەو بەشە کرداری و تیۆرییەی ڕاهێنەر دابەشدەکات و بەکاریدەهێنێت لە خولی ڕاهێنانەکانیداو ناوەڕۆکەکەشی بریتیە لە ڕاهێنان و چالاکی و ڕۆژمێریەکانی خزمەتی گەشتن بەئامانجەکان.

ئەمانەی لە خۆگرتوە:

- بابەتی زانستی: لە چوارچێوەیەکی تیۆریدا لە شێوەی پێناسە و ڕونکردنەوە و هەندێك لەو زاراوانەی داواکراون لە جێبەجێکردنی ڕاهێنانەکەدا.
- بیرخەرەوەی ڕاهێنەر﴿پەڕتوکی تێبینیەکان وانەکان﴾: بریتیە لەو چوارچێوە کرداریە جێبەجێکردنە (تطبیقات)ی ڕاهێنانەکە لە دیاریکردنی ڕۆڵی ڕاهێنەرو ڕاهێنراوەکە لە جێبەجێکردنێکی تەواوی برگەکانی ڕاهێنانەکە بە مەبەستی بەدیهێنانی چەند ئامانجێکی دیاریکراوی ڕاهێنانەکە.
- پەڕتوك و ڕۆژمێریەکانی ڕاهێنانەکە: بریتیە لەو پەڕتوکانەی جیاکراونەتەوە لە بابەتە زانستیەکان بیرەوەریەکانی ڕاهێنراوەکەیە

ڕاهێنەرەکە بەکاری دەهێنێت بۆ هەڵسەنگاندنی توانای ڕاهێنراوەکە لە ئامانجەکانی یەکە یان دانیشتنە ڕاهێنراوەکان.

یان ئەو ڕاهێنان و چالاکیانەیە کە ڕاهێنەر نایەوێت ڕاهێنراوەکە بیبینێت تاکو کاتی پێبەخشینی لەلایەن خۆیەوە.

## ٤. بەشی ڕێبەری پێداویستیەکانی بینین و بیستن:

بریتیە لەو ئامێرو پێداویستیانەی ڕاهێنەر پشتی پێدەبەستێت لە گەیاندنی ناوەڕۆکی ڕاهێنانەکە لە فایلێکی تایبەتیدا کۆکراوەتەوەو ئامادەکراوە یان لە شێوەی چەند CD یەکدا ئامادەکراوە بە مەبەستی نمایشکردنیان لە کاتی پێویستیدا بۆ ڕونکردنەوەی چالاکیەکانی ڕاهێنانەکە.

## ٥- بەشی ڕێبەری نمایشکردنی بابەتەکە:

بریتیە لە بابەتەکانی خولەکە بە شێوەی «بەرنامەی POWERPOINT» ئامادەکراون ڕاهێنەر وەك یارمەتی دەرێك بۆی لە وتنەوەی وانەکاندا بەکاریدەهێنێت.

## ٦- بەشی ڕێبەری سەرچاوە زانستیەکان:

ئەم بەشەش پێکهاتوە لە لیستی ناوی ئەو سەرچاوە زانستیانەی ڕاهێنەر بەکاری هێناوە لە ئامادەکردنی بابەتەکەیدا بۆ ئەوەی ئاسانکاری بێت بۆ ڕاهێنەر لەوکاتەی دەیەوێت بگەڕێتەوە بۆ سەرچاوەی بابەتەکە بۆ زانیاری زیاتر.

## ٧- بەشی ڕێبەری پاشکۆکان:

ئەمەش بەشێکە لە پۆستە کە پێکهاتوە لە هەندێك بابەتی جیاواز لە ناوەڕۆکی ڕاهێنانەکە وەك پاشکۆیەك بەکاردێت لە لایەن ڕاهێنەرەوە بۆ سودپێگەیاندنی ڕاهێنراوەکان بەبێ ئەوەی لە ڕەگی بابەتەکەدا بێت و ئەم شتانەشی لە خۆی گرتوە ﴿لیستی هەڵسەنگاندنی خولی ڕاهێنانەکە, پرۆشەری خولەکە, هەندێك دەستنوس و نوسراوی یاسایی جێبەجێکردنی خولەکە ..... هتد﴾ زۆر شتی تریش کە پەیوەندی بە پاکێجێکی تایبەتەوە نیە.

## هەنگاوە گردارییەکان پاکێجەکانی ڕاهێنان

ئامادەکردنی پاکێجەکانی ڕاهێنان بە هەندێك هەنگاوو زنجیرەدا تێپەڕدەبێت بەپێی ئەو وێنەیە دیاریکراوە :


کۆمەڵی
نیشانەکراو
دیاریکردنی کار
زانیارییەکان
مەهارەکان
ئاراستەکان
داڕشتنەوەی
ئامانجەکان
دیاریکردنی
ناوەڕۆک
سەرەکی ولقی
ڕیکخستن
وبەجۆرکردنی
ناوەڕۆک




## سیفەت و تایبەتمەندیەكان [جیاكەرەوەكان]ی پاكێجەكانی ڕاهێنان

ژمارەیەك سیفات و جیاكەرەوە هەیە بۆ پاكێجەكانی ڕاهێنان لە خۆیدا سیستەمێكی تەواوی دروستكردوە كە كاریگەریەكی باشی لەسەر پاكێجەكانی ڕاهێنان هەبێت.

بە ڕێكوپێكی ناسراوە چونكە پاكێجەكانی ڕاهێنان سیستەمێكی تەواوی گشتی بۆ ڕاهێنانەكان دادەنێن و پاكێجەكە چەند ئامانجێكی سنورداری

هەیە کە چەند چالاکی و شارەزایی جۆراوجۆری ڕاهێنانی لە خۆی گرتوە.

وەك سیستەمیش چەند لقێکی تری ڕاهێنانی لە خۆی گرتوەی کاریگەریان لە سەر یەکتری هەیە بۆ ئەوەی لە کۆتایدا بەشداربن لە بەدیهێنانی ئامانجی ڕاهێنانەکە بەگشتی.

دەتوانین وەك سیستەم بەم شێوەیە لە پاکێجەکانی ڕاهێنان تێبگەین.

## ١. پرۆگرام سازی [المنهجیە]

پاکێجەکانی ڕاهێنان لە شێوەی پرۆگرامێکی زانستی ڕێکو پێکی نەخشەی بۆ دادەنرێت واتە ناوەڕۆکی پۆستی ڕاهێنانەکە لە شێوەی پرۆگرامێکی ڕیکوپێك و جواندا ڕێکخراوە کە خزمەت بە ئامانجەکانی ڕاهێنانە کە لەلای ڕاهێنەرەکان بکات.

## ٢. ڕاپۆرت [تقاریر]

پاکێجەکانی ڕاهێنان بەپێی پرۆگرامێك نەخشەکێشراوە کە ڕاهێنەر بتوانێت بە تەنها خۆی بەکاریبهێنێت بە ڕەچاوکردنی ئەوەی کۆمەڵێك بەڵگەی ڕونی لە خۆی گرتوە کە چۆنیەتی بەکارهێنانی پاکێجەکە لەلایەن ڕاهێنەرەکانەوە ئاساندەکات.

لەگەڵ ئەمانەشدا ڕاهێنراو مافی هەڵبژاردنی ئەو بابەت و چالاکیانەی هەیە کە لەگەڵ حەزو شارەزایی خۆیدا دەگونجێت ئەمە لە لایەك لە لایەکی تریشەوە مافی هەڵبژاردنی کات و شوێنی ڕاهێنانەکەشی هەیە بەپێی ئەوەی کەبۆی دەگونجێت.

### ٣. ڕاهێنانی خۆیی [التدریب الذاتي]

پاکێجی ڕاهێنانەکان بەشێوەیەك ڕێکدەخرێت ڕاهێنەر بەتەنیا خۆی توانای وتنەوەی بابەتەکانی هەبێت بەبێ ئەوەی پێویستی بە کەس هەبێت چونکە بابەت و ناوەڕۆکەکانی پاکێجەکە بە شێوەیەکی وا ڕونکراوەتەوە کە بەئاسانی دەیگەیەنێتە ئامانجەکانی ڕاهێنان و ناوەڕۆکەکەی.... هتد بە یارمەتی دەرێکی خۆیی دادەنرێت بۆ ڕاهێنانەکە کەوا لە ڕاهێنەر دەکات خۆی حەزبکات لە بەکارهێنانی و سودوەرگرتن لێی.

### ٤- ئامانج یان کۆمەڵە ئامانجێکی دیاریکراو [هدف او اهداف محدده]

هەمو پۆستێکی ڕاهێنان ئامانجێك یان کۆمەڵە ئامانجێکی ڕاهێنانی دیاریکراوی هەیە هەروەها پاکێجی ڕاهێنانەکان کۆمەڵێك شارەزایی و چالاکی ڕاهێنان لە خۆی دەگرێت بۆ بەدیهێنانی .

### ٥- کەرەستەو چالاکی و شارەزایی [موادو انشطةو خبرات متعددة]

پاکێجەکانی ڕاهێنان بەپێی تێگەیشتنیان کۆمەڵێکی زۆر لە کەرەسەو چالاکی و شارەزایی جۆراوجۆری ڕاهێنان لە خۆی دەگرێت .

هەمـەجۆری لـە کەرەسـەو چـالاکی و شـارەزایی پاکێجەکـە تـا ئاستێك گونجاوە لـە هەمـەجۆری حـەزو پێداویستی و ئامادەکاری و تواناکان لای ڕاهێنراوەکـان چـونکە بـوار بـە هـەمو ڕاهێنراوێـك دەدات جـۆری ئـەو چالاکیە هەڵبژێرێت کە دەگونجێت لەگـەڵ حـەزی خۆیـدا ئەمە لەلایەك لـە لایـەکی تریشـەوە ئـەو پێداویسـتیانە گونجـاوە لەگـەڵ ئامـادەبون و تواناکانی بۆ وتنەوەی بابەتەکان.

## ٦- هۆکار و تەکتیکیە جۆراوجۆرەکانی ڕاهێنان:

دیـارترین سـیفەت کـە پاکێجـەکانی ڕاهێنــان خــاوەنێتی و پێـی جیادەکرێتـەوە ئەوەیـە کـە چـەند پێداویسـتیەکی جۆراوجۆری ڕاهێنان بەکاردەهێنێت.

کـرداری دامەزرانـدن و بـەکارهێنانی پێداویستی تەقـەنی پێشکەوتوی ڕاهێنـانی جۆراوجـۆر لـە پاکێجـەکانی ڕاهێنانـدا سـەرنج دەخاتـە سەر بنەمایەك لە بنەماکانی ڕاهێنان کە دەڵێت ﴿چـەند زۆرتـرین خاسیەت لــە ڕاهێنراوەکانــدا دامەزرانــد ئەوەنــدەش چــالاکی و توانـا بەدەستدەهێنیت لە کرداری ڕاهێنانەکاندا﴾.

## ٧. سەرنج خستنەسەر کردارەکانی ڕاهێنان و ئاکامەکانی بەیەکەوە:

پۆستەکانی ڕاهێنان چالاکی یان شارەزایی ڕاهێنان ناکات بە ئامانجێك بەتـەنها بـەڵکو دەڕوانێتـە ئـەو ئاکامانـەی لـەو چـالاکی و شـارەزاییەی ڕاهێنانەکاندا بەدەستدێت.

لەسەر ئەو بناغەیە بەو شێوەیە پاکێجی ڕاهێنانەکە بە ڕێگایەکی دروست و تەواو لە یەك کاتدا تێکەڵی دەکات لە نێوان کردارەکانی ڕاهێنانەکە و ئاکامەکانی.

## ٨. هەڵسەنگاندنی بەردەوام [التقویم المستمر]:

کرداری هەڵسەنگاندنی ئاستی بەدیهێنانی ئامانجەکانی پاکێجی ڕاهێنانەکە لەلایەن ڕاهێنراوەکانەوە بەشێوەیەکی بەردەوام دەبێت.

ئەم کردارەش ئامانجی تاقیکردنەوەی ڕاهێنراوەکان نیە لە کۆتایی پرۆگرامی ڕاهێنانەکە بۆ دڵنیابونەوەیان لە بارستایی یان ڕێژەی تێگەیشتن و جێبەجێکردنی پرۆگرامەکە لەلایەن ڕاهێنراوەکانەوە بەڵکو ئەوە کردارێکە لە سەرەتاوە پێش چونە ناو پرۆگرامەکە دەستپێدەکات و تاکۆتایی خولەکەش و تەنانەت دوای تەواوبونیشی ئەم کردارە واتە ﴿هەڵسەنگاندنەکە﴾ بەردەوامە.

## ٩. ﴿التغذیة الراجعة﴾

ئەو ڕۆڵەی کە (التغذیة الراجعه ) پێی هەڵدەستێت بریتیە لە بەخشینی (تزوید) ئەو زانیاریانەی پەیوەستە بە بواری بەدیهێنانی ئامانجەکانی ڕاهێنانەکەو پاشان دەرخستنی ئەو ڕێگریانەی بەهۆی کەموکورتیانەی بون بە ڕێگر لە بەردەم بەدیهێنانی ئامانجەکان.

لە حاڵەتی بونی کەموکورتیدا:

## پازده سەرچاوە [عنصر] هەن بۆ بونیادنانی پاکێجەکانی ڕاهێنان:

چەند سەرچاوەو سیفاتێکی تر هەن بۆ پاکێجەکانی ڕاهێنان بەشداری دەکەن لە بەرزکردنەوەی بەهاوگرنگی پۆستەکان ئەو سەرچاوانەش بە پێداویستیەکی کاریگەر دادەنرێن بۆ پاکێجەکانی ڕاهێنان کە بریتین لە :

١- پێویستە هەمو پاکێجێك ناو یان ناونیشانی تایبەت بە خۆی هەبێت بۆ ئەوەی لە ڕێگەیەوە بناسرێتەوە وەك ﴿پاکێجی چۆنیەتی بەڕێوەبردنی پۆل - بەڕێوەبردنی بە ئامانج - پاکێجی پلانی ستراتیژی ...... هتد﴾

٢- سەرنج خستنەسەر یەك جۆر چالاکی دیاریکراو لەلایەن پاکێجەکەوە یان سەرنج خستنەسەر کۆمەڵێکی بچوك لە چالاکی کە پێکەوە بەستراون و تەواوکەری یەکترن

٣- پاکێجەکە دەبێت سەرنج بخاتە سەر ڕاهێنراوەکە زیاتر لە ڕاهێنەرەکە بە ڕەچاوکردنی ئەوەی کرداری بەکارهێنانەکە لەسەر بناغەیەکی خۆیی لەلایەن ڕاهێنەرەکەوە بەکاردێت.

٤- سەرنج خستنەسەر ئامانجەکانی ڕاهێنانەکە زیاتر لە سەرنج خستنەسەر چالاکیە ڕاهێنانیەکان بە ڕەچاوکردنی ئەوەی ئەنجامدانی ئامانجەکانی ڕاهێنانەکە پێوانەیە بۆ بڕیاردان لەسەر دەستکەوتنی

ڕاهێنراوەکە یان ئەو چالاکیانەی کە پاکێجی ڕاهێنانەکە هەوڵی بەخشینی دەدات بە ڕاهێنراوەکە.

٥. پاکێجەکانی ڕاهێنان چەند چالاکی و شارەزایی و کەرەستەو شێوازو ڕێگای ڕاهێنانی جۆراوجۆر لە خۆی دەگرێت بۆ ئەوەی بوار بە ڕاهێنراو بدات بە ئارەزوی خۆی ئەو بابەتانە هەڵبژێرێت کە لەگەڵ حەزو ئارەزوی خۆیدا دەگونجێت.

٦- پێویستە پاکێجی ڕاهێنانەکە ئابوری بێت لە ڕوی بارستایی چالاکی و شارەزایی و ئەو کەرەستانەی دەیگرێتەوە واتە تەنها ئەو چالاکی و شارەزایی و کەرەستە سەرەکیانە لە خۆی بگرێت کە یارمەتی دەرن بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانی پاکێجەکە چونکە ئامانج کۆکردنەوەی چالاکی و شارەزایی و کەرەستەکان و زۆربونیان بەسەریەکتردا نیە بەڵکو ئامانج بژارکردن و هەڵبژاردنی ئەو بابەتانەیە کە گونجاوبێت لەگەڵ چالاکی و شارەزایی و کەرەستەکان بۆ گەیشتن بە بەدیهێنانی ئامانجەکانی پاکێجەکە.

٧- پێویستە پاکێجی ڕاهێنانەکە لیستێکی بیبلۆگرافی لە خۆی بگرێت و هەمو ئەو سەرچاوەو چالاکی و خوێندنەوە زیادکراوانەی تیایدا بێت کە پەیوەندیان بەکارامەکردنی ڕاهێنانەکەوە هەیە.

٨- پاکێجی ڕاهێنانەکە پێویستە پەیوەندیەك لە نێوان بیرکردنەوەو کردارو جێبەجێکردنیدا دروستبکات.

٩- پاکێجی ڕاهێنانەکە پێویستە کۆمەڵێك پێداویستی و کەرەستەی پێشکەوتو دابمەزرێنێت بۆ ئەوەی ئامانجەکانی بهێنێتەدی لە ڕوانگەی

ئەوەی ئەو تەقەنیاتانە کاریگەریەکی هۆشداری پێدەگەیەنن لە ڕێگەی
ئەوانەوە شارەزایی و چالاکیەکانی ناو پاکێجەکە پێشکەش بە
ڕاهێنراوەکان دەکرێت.

١٠- پێویستە پاکێجەکانی ڕاهێنان ناوەڕۆکەکەی بریتی بێت لە
هەندێك ڕێگا بۆ کۆکردنەوەی ﴿التغذية الراجعة﴾ بۆ پەرەپێدان و
دوبارە نوێکردنەوەی بە شێوەیەك بگونجێت لەگەڵ واقعەکەدا واتە
تواناى ﴿update﴾ کردنەوەی تیابێت.

١١- دەبێت پاکێجی ڕاهێنانەکە پەیوەندی بە واقعی ڕاهێنانەکەوە
هەبێت و دوچاری هەندێك هەڵوێستی واقعی بکرێت کە لە داهاتودا
وەریدەگرێت.

١٢- پێویستە لە کاتی ئامادەکردنی پاکێجێکی ڕاهێناندا ڕەچاوی ئەو
مەرجانە بکرێت کەبۆی دانراوە وەك ﴿ئامـاژەکردن بە سەرچاوەکان
بەکارهێنانی ڕێبەرو هامشەکان﴾ بەپێی ئەو بنەمایانەی باوەڕپێکراوە
لە پڕۆگرامی لێکۆڵینەوە زانستیەکاندا.

١٣- پێویستە کرداری ئامادەکردن و نەخشەکێشانی پاکێجەکانی ڕاهێنان
بخرێتە ژێر چەند تاقیکردنەوەو ئاستێکی هونەری و هەمو تەقنیە
تازەکانی تیادا بەکاربهێنرێت هەروەها دەرهێنان و بەرهەم هێنانی
پاکێجەکە پێویستە زۆر سەرنجڕاکێش و دڵگیربێت و ڕێکخستنیشی بە
شێوەیەکی ئاسان بێت تاکو بتوانرێت بەکاربهێنرێت و دابمەزرێت.

١٤- پێویستە پاکێجەکە بەڵگە شیاوەکانی ڕاهێنان لە خۆی بگرێت وەك ﴿چوارچێوەی گشتی پاکێجەکەو ڕێبەری ڕاهێنەرو ڕاهێنراوەکەو...هتد﴾ و هەر بەڵگەیەکی تریش کە شیاو و گونجاوبێت.

١٥- پێویستە پاکێجەکە خشتەیەکی دیاریکراوی بۆ دابنرێت لە جێبەجێکردنی ئەو چالاکیانەی کە لە خۆی گرتوە بە تاکی بێت یان بە گروپین.

## پڕۆگرامسازی پاکێجەکانی ڕاهێنان﴿منهجیة الحقائب التدريبية﴾

زۆرینەی دەزگاکانی ڕاهێنان بەرەو ئاڕاستەی پشتبەستن بە بنچینەیەکی تیۆری دیاریکراو دەڕۆن کە ڕێنمایان دەکات بەرەو کرداری پلان و نەخشسازی و بەهێزکردنی کردارەکانی ڕاهێنان ئەم بنچینەیەش ناودەبرێت بە چوارچێوە یان نمونەیەکی تیۆری ڕاهێنان.

چەند بەڵگەیەکی پەسەندو تاقیکراوە هەیە چەخت لەسەر ئەو بیرۆکەیە دەکات ئەو ڕاهێنەرانەی پشت بەم چوارچێوە یان نمونە تیۆریانە دەبەستن زۆرتر سەرکەوتوترن لە چاو ئەو ڕاهێنەرانەی پشتی پێنابەستن .

ئەو چوارچێوە یان نمونە تیۆرییانەی پاکێجەکانی ڕاهێنان سەرنجی دەخەنەسەرو پێشکەوتوترو دڵنیایی ترە لە چوارچێوەو نمونە تیۆریەکانی تر بەم شتانە لەوانی تر جیادەکرێتەوە:

١- سەرنج خستنەسەر بیردۆزی «سکنەر» لە مەرجەکانی کارکردنی کە تاقیکردنەوە بە بناغەی سەرەکی بۆ پەرەپێدان و گەشە پێکردنی ڕاهێنانەکە دادەنرێت.

٢- پشتبەستن بە بیردۆزی «التعزیزو التغذیة الراجعە» وەك نێوەندکارێك بۆ دامەزراندن و ڕێکردنەوەی هەڵسوکەوتی ڕاهێنراوەکان.

٣- سەرنج خستنەسەر گۆڕینی «سلوك»ی بینراو یان ئەو سلوکەی تێبینی کردنی ئاسانە لە ڕواڵەتی دەرەکیدا نەك ئەو سلوکەی ناوەکیەو لە ناو دەروندایە.

٤- باوەڕبون بە پێویستی بەشداری پێکردنی ڕاهێنراوەکە بەکەسی خۆیی لە کاتی کرداری ڕاهێناندا پێویستە خولەکە زۆر کاریگەربێت نەك (منفعل) هەڵچو.

٥- باوەڕبون بە تاککردنی (تفرید) ڕاهێنان بە ڕەچاوکردنی ئەوەی ڕاهێنراوان جیاوازن لە پێداویستی و تواناو پاڵنەرەکان و خێرایی لە فێربوندا.

چوارچێوە یان نمونەی تیۆری بۆ ڕاهێنان کە پاکێجەکانی ڕاهێنان پشتی پێدەبەستێت لەم سەرچاوانە پێکدێت:

## پێوەرەکانی جۆرێتی پاکێجەکانی ڕاهێنان [معاييرالجوده للحقائب التدريبيه]

• گونجاندن : مەبەست لێی دەستپێکردنی پاکێجی ڕاهێنانەکەیە لە ڕوی (بینین)و بنچینەکانەوەو ئاستی ڕێکخستن و گونجاوی لەگەڵ سیاسەتی گشتی فێربون و ڕاهێنان .

• ڕێکوپێکی (الانتظام) مەبەست لێی ئاستی پابەندبونی دروستکردنی پاکێجی ڕاهێنانەکەیە لە ژێر ڕۆشنایی ئەو بنچینەو پلانانەی (پڕۆسیجەر) لە دەزگاکاندا داواکراوە.

• نەرمی نواندن (المرونه): مەبەست لێی توانای جێبەجێکردنی پاکێجی ڕاهێنانەکەیە بەپێی کات و بارودۆخ و تواناکان.

• وردی﴿کوالیتی-الدقة﴾: مەبەست لێی ڕونی پاکێجی ڕاهێنانەکەیە و دوریەتی لە قورسی و ئاڵۆزی.

• ڕاستگۆیی ﴿المصداقية﴾ : مەبەست لێی ئاستی گشتگیریکردنی پاکێجەکەیە لە مەبەست و ئامانجەکاندا.

• توانای گەشەپێکردنی هەبێت ﴿قابلة للتطور﴾: مەبەست لێی توانای دەستکاریکردن و گەشەپێکردنی پاکێجەکەیە لە داهاتودا واتە (UPDATE﴾ کردن.

• هاوچەرخی ﴿المواكبة﴾: مەبەست لێی گونجاوی پاکێجی ڕاهێنانەکەیە لەگەڵ ئەو گۆڕانکاریانەی ڕودەدات.

- وەفاداری ﴿الوفاء﴾ : مەبەست لێی ئاستی وەفاداری پاکێجەکەیە لە سودگەیاندن بە بەشداربوان.
- گونجاوی ﴿تەبایی﴾﴿التوافق﴾: مەبەست لێی پابەند بونی پاکێجی ڕاهێنانەکەیە بە گونجاندنی لەگەڵ ناوەڕۆکەکەیی و پەیوەندییان بەیەکەوە.
- تەواوکەر ﴿التکامل﴾ : مەبەست لێی ئاستی پابەندبونی پاکێجی ڕاهێنانەکەیە بە تەواوکەری کردنی لەگەڵ ئەو شارەزایی و فێرکردنانەی لە ناوەڕۆکەکەیدا هاتوە.

وتاردان : چەند پێناسەیەك هەیە بۆی لەوانە:

ئـەفلاتون دەڵێـت: هونـەری قسـەکردنە خاوەنەکـەی وا لێـدەکات لـە قسەکردندا نایاب ﴿لێهاتو﴾ بێت.

ئەرسـتۆ دەڵێـت: بریتیـە لـە دۆزینـەوە و گـەڕان بـە دوای ڕێگاکـانی قەناعەت پێکردن لەهەر بابەتێکدا بێت.

پێویستە لەسـەر قسـەکەر ئـەو شـتەی بـە زمـانی پـاراوەوە ﴿بلاغـە﴾ قسەی لەسەر دەکات بەرامبەرەکانی وا لێبکات کە بەچاو دەبینرێن .

## وتاردان ﴿الالقاء﴾

### هونەری وتاردان: چەند پێناسەیەکی هەیە لەوانە:

- بریتیەلە دەربڕینی وشەکان بەشـێوەیەك واتـاو دەربڕینـەکانی ڕون و ئاشکران.
- بریتیە لە ڕونی وێنەی ئەو قسەکەرەی لە کاتی قسەکردنیدا جوڵەی ئەندامانی لەشی هەڵچون و گۆڕینی شێوازی دەموچاو دەردەکەوێت.
- جـاحظ دەڵێـت: پێویسـتە قسـەکەر پێوانـەی قسـەکانی بزانێـت بـۆ ئەوەی هاوسەنگی لە نێوان خۆیی و گوێگران و ئەو حاڵەتانـەدا بکات کەباسی دەکات.
- وتاری کاریگەر: بریتیەلە گواستنەوەی نامەیـەك بـۆ ئامـادەبوان بە ڕێگایـەك گۆڕانکـاری خـوازراو ڕوبـدات لـە ئامـادەبوان و لـە یـەکتری تێبگەن.

## سەرچاوەکانی وتاردان

### ﴿ئامادەبون - نێوەندەکان ﴿الوسائط﴾- پێشەکی وتار - پەیامەکە﴾

#### نمایشکردن ﴿العرض﴾:—

بریتیە لە پەیوەندیەکی ڕوبەڕوی زارەکی کەسێك پێی هەڵدەستێت بۆ گەیاندنی پەیامێکی دیاریکراو بۆ کەسانێکی دیاریکراو.

بۆ گەیاندنی پەیامەکەی پشتدەبەستێت بە پەیوەندی زارەکی ڕاستەوخۆ لە ڕێگەی پێداویستیەکانی بینین وەك ﴿سلایدو داتاشۆو ڤیدیۆ﴾ بۆ گەیشتن بە ئامانجی پەیامەکە.

#### ئامادەکردنی نمایش:

بە یەکێك لە سیاسیەکانیان وت:

دەمانەوێت قسەیەکمان بۆ بکەیت یەك کاتژمێر بخایەنێت !

وتی: ئێستا !

پاشان پێیان وت: دەمانەوێت نیو کاتژمێر بخایەنێت.

پێی وتن: ڕۆژێك ماوەم بدەن !

پاشان پێیان وت: دەمانەوێت ماوەی دە (١٠) خولەك بێت پێی وتن: ماوەی دوڕۆژم پێبدەن !

## کارامەیی نمایشکردن و وتاردان

- ڕێك ڕاوەستان : سنگت دەرپەڕێنەو هەردو قاچت لە شێوەی ژمارە (١١) دا بێت.
- بەکارهێنانی دەستەکان.
- ڕوخۆشی (خەندەیی).
- کارامەیی لە بەکارهێنانی چاوەکان.
- سەرەتایەکی کاریگەر (چیرۆك – پرسیار - زانیاریەکی نامۆ)
- کارامەیی زاڵبون بەسەر خۆتدا.
- کارامەیی بەکارهێنانی جەستە.
- کارامەیی بەکارهێنانی دەنگ.

## پێشکەشکردن (التقديم)

زاراوەیەکە بەکاردێت لە زمانەوانیدا بۆ ئەوەی کرداری نمایشکردن و وتارەکە بگرێتەوە کە ئاماژەدەکات بۆ ئەدای گشتی قسەکەر.

هەروەها بریتیە لە کارامەیی و هونەرێك زۆر لە تواناکان لە خۆی دەگرێت وەك توانا لە دەربڕین و زاڵبون بەسەر زمانەکەداو داڕشتنێکی هونەری و کاریگەر لەسەر دەرونی گوێگران.

## ناو چی دەگەیەنێت ؟

ئەگەر تۆ لە شوێنێکی قەرەباڵغدا بیت و تاڕادەیەکی زۆر سەرقاڵ بویت خێراترین شت کە هەستەکانت بۆ خۆی ڕادەکێشێت بریتیە لە

ناوی خۆت بۆیە بانگکردنی ڕاهێنراوەکان بە ناوی خۆیانەوە بە ئالەتێکی بەهێز دەژمێردرێت بۆ بەجێهێشتنی سروشتێکی باش لای ئامادەبوان.

ستراتیژی (صمو) بۆ بیرکەوتنەوەی ناوەکان خاوەنی RONWITE بۆ لە جیهانی بیرخستنەوەکان:

بۆ ئەوەی وەك ڕاهێنەرێك ناوی ڕاهێنراوەکانت لە بیربمێنێتەوە ڕەچاوی ئەم خاڵانە بکە:

## ١- ناوەکە بگۆڕە بۆ وێنە: چۆن ؟

بۆ نمونە :

شاژن = شاژن دیانا

حوریە = حۆریەی ناودەریا

ژیر = زیرەکی

زانا = زاناکان

دانا = داناکان (چیاوە ژیرەکان)

## ١- جیاکەرەوە ﴿تایبەتمەندی﴾

بگەڕێ بە دوای نیشانەیەك یان جیاکەرەوەیەك لە ڕوخساری کەسەکەدا بۆ نمونە ﴿ناوچەوان – چاوەکانی . قژی سەری – لوتی – دەمی – گوێچکەکان - چەناگەی ﴾ هەر نیشانەیەکی تایبەتمەندی هەبێت.

## ٢- پەیوەندی ﴿پێکەوەلکان﴾

نیشانەکە ببەستەرەوە بە وێنەیەکی نامۆوە لە شێوەی پێکەنیندا بێت. هەندێك جار ﴿نوکتـە - نـامۆیی- بارسـتایەکی بچوك - بارستاییەکی گەورە - ڕەنگێکی تایبەت – ژمارە - گەورەکردن .... هتد﴾

## ٣- نمونە ﴿ئەسپسوارێک﴾

دیمەنەکـە بـەم شـێوەیەیە: ئەسپسـوارێك سـواری ئەسـپەکەی دەبێـت و لوتی ئەوەندە گەورەیە تا ڕادەی بەرکەوتنی بۆ سەرزەوی.

بـەو شـێوەیە هـەمو ناوەکـان جێگیردەکـەیت لەگـەڵ ڕەچاوکردنی ئـەم بنچینانە:

١. جـوان گـوێبگرە بـۆ نـاوی کەسـەکەو لـە کـاتی خۆناسـاندنیدا جوان تێبینی بکە.

٢. لە کاتی قسەکردن لە گەڵیدا زوبەزو ناوی بهێنە.

٣. ناوەکەی دوبارە بکەرەوە.

### یەکەم سروشت

لێکۆڵینـــەوەو زانســـتەکانی دەرونناســـی ڕونیـــان کردوەتـــەوە کـە هەڵسەنگاندنی بەرامبەرەکان لە زانیاریـە سـەرەتایەکانەوە بەدەستدێن و زیـاتر لـەو زانیاریانـەی دوایـی دێـن, چـونکە یەکـەم سروشـتت لەگەڵ ڕاهێنراوان چۆن بێت تاکو کۆتـایی وا دەبێـت و کاریگـەریش دەکاتـە سەر ئەو زانیاریانەی پێیان دەبەخشیت.

له سەرەتاوە سوربە لەسەر دروستکردنی سروشتێکی باش لە نێوان خۆت و ڕاهێنراوەکان ﴿سەرەتای کاریگەر – شکاندنی سەهۆڵ﴾.

بۆ نمونە: ئەگەر لە سەرەتاوە توانای سەرکەوتنت هەبو بەسەر وتنەوەی بابەتەکەو گەشبین و هاوکاربویت لەگەڵ بەشداربوان ئەوا هەستێکی باش لایان دروستدەبێت بەرامبەرت و حەزدەکەن بە بەردەوامی بون لە خولەکەتدا.

بە پێچەوانەوە ئەگەر سەرەتای خولەکەت بە ماندوێتی و شلەژاوی دەستپێکرد ئەوا بەشداربوان هەر لە سەرەتاوە بۆچونێکی خراپ بەرامبەرت دروستدەکەن و لێت بێزاردەبن و حەزی بەشداربونیان نامێنێت ئەگەر لە خولەکانی تردا بەتواناو چالاکیش بێت.

بۆیە لە سەرەتاوە دەریبخە کە تۆ کەسێکیت گفتوگۆکردن لە گەڵیدا ئاسانە.

## سەرچاوە سروشتیەکانی هەوەسەکانت ﴿عناصر حالتک المزاجیة﴾

- وزەی جەستەیی.
- دەربڕینی ڕوخسارت.
- دەربڕینی سۆزداری لە کاتی قسەکردندا.
- ئەو دەستەواژانەی بەکاریان دەهێنیت ﴿بەهێزبن یان بێهێز﴾.
- سەرنجڕاکێشانی ئەرێنی.

## وتاردان ﴿ئاستی دەنگ﴾

### دەنگ ﴿پێناسەکان﴾

گرنگترین پێداویستیە لە دەربڕینی ئەو شتانەی لە دەرونتدا هەیە چونکە(دەنگ) واتاکان دەگەیەنێت لە نێوان بەرزونزمی و گرتنی هەناسەو بەردانی و خێرایی و خاو لە وتنەوەدا ﴿ئەدا﴾.

لەڕوی فیزیکیەوە: دەنگ هەوایەکە شەپۆل دەدات لە ئەنجامی پێکدادانی لە نێوان دوجەستەدا, دەنگی مرۆڤیش لە ئەنجامی شەپۆلدانی ئەو هەوایەو دەرچونی لە دەمی مرۆڤەکانەوە دروستدەبێت وەك کرداری ﴿فیکە لێدان﴾.

هەریەکێکیش لە ئێمە دەنگێکی تایبەت بە خۆی هەیە کە جیای دەکاتەوە لە کەسەکانی ترو کەسایەتی دەردەخات.

هەوڵبدە دەنگێکی تایبەت بەخۆت بدۆزیتەوە و گرنگی پێبدەو هەوڵی لاسایی کردنەوەی کەس مەدە.

دەنگ بەشێکە لە بەهرە سروشتیەکانمان.

لێکۆڵینەوە بەناوبانگەکەی پرۆفیسۆر ﴿ئەلبرت مهربیان﴾ لە زانکۆی لۆس ئەنجەلوسی ئەمریکی سەلماندویەتی: کاریگەری جوڵە﴿ئاستی دەنگ﴾ لە سەربەشداربوان بەڕێژەی ٣٨٪ بەلأم کاریگەری ناوەڕۆکی بابەتەکان بەڕێژەی ٧٪ .

## سەرچاوەکانی

### ١- چینەکانی دەنگ ﴿طبقات الصوت﴾:

جۆراوجۆرکردنی چینەکانی دەنگ هۆکارێکە بۆ دورخستنەوەی بێزاری و کاریگەرکردنە سەر کەسەکان بۆیە ئاگاداری ئەوەبەو پێویستە ساتەوساتێك ئاستی دەنگت بگۆڕیت لە نزمی بۆ بەرزو بە پێچەوانەشەوە.

کرداری ڕێککردنی دەنگ سەرەتای دەستپێکردنی ڕاهێنانی باشە بۆ قسەکەرە بەتواناکان.

### ٢- تێکڕایی دەنگ ﴿معدل الصوت﴾:

ئەو شەپۆلانەیە کە قسەی پێدەکەیت.

پەلەکردن لە قسەکردندا سروشتێکی خراپ لای بەشداربوان دروستدەکات و نیشانەی بەرپێکردنی کارێکەو خاوی زۆریش بەهەمان شێوە بەشداربوان توشی بێزاری دەکات بۆیە پێویستە ڕاهێنەر ناوەندگیریەك بکات لە نێوان خێرایی و خاوی دەنگیدا بەپێی ناوەڕۆکی بابەتەکەو بیرۆکەکان ئەو کاتە کەشێکی پڕ لە چالاکی و گۆڕانکاری لە هۆڵەکەدا دروستدەکات.

بۆ ئەوەی سەرکەوتوبیت لەو کارەدا پێویستە لە ماڵەوە یان لە هەرشوێنێکی تردا بێت ڕاهێنان لە سەر بابەتەکەت بکەیت و تۆماری دەنگی بکەیت بۆ ڕاگرتنی کاتەکانت.

## ٣- بارستایی دەنگ ﴿حجم الصوت﴾

مەبەست لێی بەرزونزمی ئاستی دەنگە.

ئەو ڕاهێنەرەی دەنگی بەرز دەکاتەوە تا دەگاتە ئاستی هاوارکردن هەستێکی وا لای گوێگر دروستدەکات کە ئەم ڕاهێنەرە توڕەو سۆزدارە.

بەڵام خاوەنی دەنگێکی نزم بە ترسنۆك و شەرمن لە قەڵەم دەدرێت.

هەردوکیشیان لە ڕاهێناندا بە هیچ شێوەیەك باش نین بۆیە و پێویستدەکات لە هەندێك شوێندا دەنگت بەرزبکەیتەوەو بەپێچەوانەشەوە لە هەندێك شوێنی تردا وا پێویستدەکات دەنگت نزم بکەیتەوە بەپێی بابەت و شوێنەکە.

لەوانەیە هەندێك شوێن وا پێویست بکات ناوەندگیربیت لە دەنگتدا بەتایبەتی لە کاتی گێڕانەوەی ڕاستی و ئامارەکاندا .

### تێبینی

A : پێویستە دڵنیابیت لەوەی دەنگت بۆ هۆڵەکە گونجاوە.

B: پێویستە دڵنیابیت لەوەی ئامادەبوانی ڕیزی پشتەوە گوێیان لێتە.

C: پێویستە دڵنیابیت لەوەی ئامادەبوانی ڕیزی پێشەوە بە دەنگت بێزارنابن.

D:چاو بخشێنە بە هەمو شتەکانی ناو هۆڵەکەو دڵنیابە کە هەمو شتێك ڕێکوپێکە.

E : دڵنیابە لە باش کارکردنی ئامێرەکانی دەنگ.

F : لە یادت بێت باشترین ڕێگا بۆ گوێگرتن هێمنیە.

## ٤- پەرۆشی ﴿الحماسة﴾

پەرۆشی ئەرێنی سنورێکی هەیە ئەگەر زیاتر لە سنوری خۆی تێپەڕی لەوانەیە زیانی هەبێت و لەسەری بکەوێت.

چەندەها ناوەڕۆکی باش هەبوە گوێی بۆ ڕانەگیراوە لەبەر ئەوەی بەشێوەیەکی نادروست پێشکەشکراوە.

## ٥- ڕاوەستان ﴿الوقفات﴾

شێوەی ڕاوەستان بۆ ڕاهێنەر کارێکی گرنگەو باشترین شێوازیشە بۆ سەرنج ڕاکێشانی ئامادەبوان.

بریتیە لە خاڵی وەرچەرخان لە نێوان گوێگرو ڕاهێنەردا.

﴿ شێوازی ڕاوەستان گەورەترین نهێنیە لای ڕاهێنەر ﴾ غریفل چانر

بۆ نمونە: لە سەردەمی پێغەمبەردا﴿دروودی خودای لە سەربێت﴾ کابرایەك وتارێکی بۆ خێڵەکەی دەداو ئایەتێکی خوێندەوەو وتی: ﴿ ومن يطع الله ورسوله فقد رشد ومن يعصمهما فقد غوي ﴾ لە کاتی وتنی ﴿يعصمهما﴾ ڕاوەستا. بۆیە پێغەمبەری خودا پێی فەرمو: تۆ خراپترین وتاربێژی خێڵەکەتی چونکە دەبوایە لە جیاتی وەستان لە سەر وشەی ﴿يعصمهما﴾ لەسەر وشەی ﴿رشد﴾ بوەستایتایە.

دانایی لە وتنی وشەدا نیە بەڵکو لە چۆنیەتی دەربڕینیدایە.

## حەوت وەستانەکە ﴿الوقفات السبع﴾:

١. دەستپێکردن ﴿دواى سەرەتا﴾.

٢. پێش قسەکردن.

٣. پێش پرسیارکردن.

٤. پێش چونە ناو بابەتێکی نوێ.

٥. لە پاش وشەی کۆتایی.

٦. لە کاتی ژاوەژێدا.

٧. پێش وتنی سوپاس.

## فێربە چۆن هێزی بێدەنگی بەکاردەهێنیت ئەگەر بۆ چەند چرکەیەکیش بێت

### ١. دوبارەکردنەوە

بریتیە لە دوبارەکردنەوەی هەندێك وشە زیاتر بۆ دڵنیاکردنەوەی گوێگر لە وشەیەك یان زانیاریەك.

دوبارەکردنەوە کاردەکات لەسەر کاریگەرکردنە سەر گوێگرو سەرنجراکێشانی بۆ زانیاریەکە.

بۆ نمونە: وەك ﴿بێدەنگی...بێدەنگی.... بێدەنگی﴾

### ٢. سەرنجدان ﴿التركيز﴾

بە واتای جەختکردنەوەی وشەیەك کە تۆ بە گرنگی دەزانیت و دەتەوێت سەرنجی ئامادەبوانی بۆ ڕابکێشیت.

بۆ نمونە: بڵێ گەشتم کرد بۆ دوبەی ...لەوێ سەردانی بورجی خەلیفەم کرد.

سەرنج بخەرە سەر وشەی ﴿دوبەی﴾ ئەگەر مەبەستت گرنگیدان بو وشەی ﴿دوبەی﴾.

یان سەرنج بخەرە سەر وشەی ﴿بورجی خەلیفە﴾ ئەگەر مەبەستت گرنگیدان بو بە﴿بورجەکە﴾

## ٣. زمان پاراوی ﴿النطق﴾

زمان و دەربڕینی وشەکان کۆمەڵێك هەڵەی باوی هەیە دیارترینیان بریتین لە :

- لابردن و زیادکردنی پیتێك یان گۆڕینی لە ئاکامی خێرایی یان شڵەژان لە کاتی قسەکردندا.

بۆ ئەوەی دوچاری ئەو هەڵەیە نەبیتەوە باشتر وایە پێشتر ڕاهێنان لەسەر بابەتەکە بکەیت و تۆماری بکەیت یان باسی بکەیت بۆ هاوڕێیەکت بۆ ئەوەی زیاتر کۆنترۆڵی بابەتەکە بکەیت.

- هەڵەیەکی تر هەیە زۆرینەی ڕاهێنەرەکان تێی دەکەون ئەویش بریتیە لە کاتی باسکردنی زانایەك یان کەسێکی ناودار جاری وا هەیە ناوەکەی بەهەڵە دەڵێت یان لە بیری دەچێتەوە.

بۆ ئەوەی دوچاری ئەو دۆخە نەبیت پێویستە بگەڕێیتەوە بۆ سەرچاوەکان و بەباشی ناوەکان دەربڕیت و ڕاهێنانی لەسەر بکەیت چونکە ئەو جۆرە هەڵانە لە کەسایەتی ڕاهێنەر دادەبەزێنێت.

- دوبارەکردنەوەی هەندێك وشە بە بەردەوامی لە کاتی قسەکردن وەك ﴿تێگەیشتن.. وانیە.. ئاسانە.. بەهەرحاڵ..... هتد﴾ پێویستە ڕاهێنەر خۆی لێدوربخاتەوە ئەویش بەپشت بەستن بە تۆمارکردن یان داوای یارمەتی کردن لە هاوڕێیەك.

- خۆپاراستن و دورکەوتنەوە لە وشەی ﴿ها.. ئا ئا﴾ ئەو درێژکردنەوەیە لە کاتێکدایە کە ڕاهێنەر توشی شڵەژان دەبێت و بابەتەکەی ئامادەنەکردوە ئەمەش ئاماژەیەکی ترسناکە بۆ ئاستی ڕاهێنەرەکە.

# زمانی جەستە

A- ڕواڵەت: لێکۆڵینەوەکان بێگومان گرنگی ڕواڵەت و ڕوخساریان دەرخستوە، چونکە ڕواڵەت لە یەکەم بینینەوە دەستپێدەکات و مەحاڵە لە دوایدا بتوانیت ئەو بۆچونە لای ئامادەبوان، بەرامبەر بەخۆت بگۆڕیت.

ڕاهێنراو زانیاریەکان لە یەکەم بینینەوە ڕاستەوخۆ لە تۆوە وەردەگرێت بۆیە پێویستە لە یەکەم ساتدا گرنگیەکی زۆر بدەیت بە ڕوخسارت ئەگەر ڕۆچونێکیشی تیادا بێت.

پۆشینی جلوبەرگێکی جوان و لەپێکردنی پێلاوی جوان و بۆیاخکراو بەلگەیە لەسەر جۆری کەسایەتیت هەوڵبدە گیرفانەکانت خاڵی بێت و قەڵەم و شتی زەقی تێدا نەبێت کەواتە بەگشتی گرنگیدان بەڕواڵەتی جلوبەرگ و هەڵسوکەوتت زۆر پێویستە چونکە لێکۆڵینەوەکانی پرۆفیسۆر «ئالبێرت مهریبان» کاریگەری زمانی جەستەی داناوە بە ڕێژەی ٥٥٪ و ناوەڕۆکیش بەڕێژەی ٧٪ .

B- شێوازی وەستان :

قسەکەر پێویستە لەگەڵ ناخی خۆی گونجاوو ئاسودە بێت بەشێوەیەکی ڕاست بوەستێت و خۆی بەم لاو بەو لادا بانەدات و لارنەبێتەوە و نەچەمێتەوە بەڵکو لە شێوەی ژمارە (١١) دا ڕێک بوەستێت و هەردو قاچی لە زەوی بچەسپێنێت وجێگیریان بکان.

## ڕاهێنان

دەتوانیت شتێك لەسەر سەرت دابنێیت و ئەمسەرو ئەوسەر بکەیت بەبێ ئەوەی بکەویت پێویستە ڕاهێنان بکەیت لە سەروەستان بەشێوەیەکی ڕێك.

ئامۆژگاری

١- خۆت بپارێزە لە نوشتانەوە بۆ پێشەوە.

٢- خۆت بپارێزە لە نوشتانەوە بۆ هەر لایەك بێت.

٣- ڕاوەستان باشترە لە دانیشتن.

٤- هاتوچۆو جوڵە لە دانیشتن باشترە.

٥- ڕاست بوەستە (چەقێنراو بەو لە هەمان کاتدا نەرمیش بە).

C- جوڵە :

جوڵەی ڕاهێنەر لەسەر شانۆ سودێکی باشی هەیە بۆ یاریکردن بەچاوی گوێگرەکان و بێتاقەتیان ناهێڵێت و لە بێزاری دوریان دەخاتەوەو هەمیشە وایان لێدەکات سەرنجیان لەسەر جوڵەی ڕاهێنەرەکە بێت و جگە لە سودوەرگرتنی ئامادەبوان ڕاهێنەریش چالاکیەکی باشی دەبێت.

## ئامۆژگاری

١- لە سەرخۆ بجوڵێ.

٢- پشت مەکەرە ئامادەبوان تەنانەت لە کاتی ڕۆشتنیشدا بێت.

٣- جوڵە زۆر باشترە لە وەستان.

٤- خۆت دوربگره له دوبارەکردنەوەی جوڵەکان.

٥- کاتێك شتێکی گرنگ بەئامادەبوان دەدەیت «پرسیار-تێبینی ...هتد» بوەستە.

D: ئەکتەری شانۆ «لەنگەری شانۆ»

کۆمەڵە شوێنێکی دیاریکراوە لەسەر شانۆ ڕاهێنەر بۆ جوڵەی خۆی دیاریدەکات.

بۆ هەر شوێنێك شێوازێکی تایبەت بەکاردەهێنێت بۆ گەیاندنی زانیاریەکان بۆ نمونە :

١- شوێنی وتنەوەکە

٢- شوێنی پێداچونەوەکە

٣- شوێنی نمایشکردنەکە

٤- شوێنی چیرۆکەکان

٥- شوێنی پرسیارو موناقەشە کردنەکان

٦- شوێنی زانیاری و بەخشینی زانیاریەکان

ئامۆژگاری

١- شوێنەکان تێکەڵ مەکە.

٢- لە کاتی باسکردنی شتێکی گرنگدا مەجوڵێ.

٣- واباشترە سێ شوێن بۆ خۆت دیاریبکەیت بۆ جوڵەکردنت پێش هاتنەژورەوەی ئامادەبوان.

## E: جوڵەکانی دەست ﴿حركة اليدين﴾

بۆ ئەوەی پەیوەندی و تێکەڵی ڕاهێنەر لەگەڵ ئامادەبوان و زمانی جەستەی نایاب بێت پێویستە جوڵەکانی هەردودەست بەشێوەیەکی دروست کاریگەر بکرێت بۆ ئەوەی ئەو پەیامەی دەتەوێت بە ئامادەبوانی بگەیەنیت جێگەی خۆی بگرێت.

### ئامۆژگاری

١- دەستەکانت بەشێوەیەك بجوڵێنە لەگەڵ قسەکانتدا گونجاو بێت.

٢- یاری بە پێنوسەکەت یان هەرشتێکی تربێت مەیکە.

٣- دەستەکانت لە شانەکانتەوە بجوڵێنە.

٤- بەدەستەکانت ئاماژە بە کات و شوێنەکان بدە.

٥- بە پەنجەت ئاماژە بۆ هیچ کەسێك لە ئامادەبوان مەکە.

٦- کاتێك دەتەوێت بابەتێك یان موناقەشەیەك کۆتایی پێبهێنیت هەردو دەستت بخەرە ناویەکەوەو دایبخە.

٧- شانت بەلایەکدا بەریت ئاماژەیە بۆ ئەوەی قسەکردنت لەو بابەتە کۆتایی پێهاتوە.

٨- دەستەکانت کراوە بێت ئاماژەیە بۆ کردنەوەی دەرگای گفتوگۆو موناقەشەکردن.

## F : ئاماژەکان

دەربڕینەکانی ڕوخسار یەکێکە لەو پێداویستیانەی یارمەتیمان دەدات لە گەیاندنی پەیامەکەمان بە گوێگر. نابێت ڕاهێنەر ڕوخساری لە یەك شێوەدا ڕاگرێت بەڵکو پێویستە بەپێی ناوەڕۆکی بابەتەکە کاریگەری لەگەڵ ڕوخساری بکات.

## G : پەیوەندی لە ڕێگەی چاوەکانەوە

لێرەدا ڕاهێنەر دەبێت چاوی بگێڕێت بەسەر هەمو ئامادەبوان و سەیری ناوچەوانیان یان ڕوخساریان بۆ ماوەی (٥ بۆ ٦ ) چرکە بکات.

ئەگەر لە هۆڵێکی گەورەشدا بو ئەوا پێویستە بەلای ڕاستوچەپی خۆیدا بڕوانێت.

زانای بەناوبانگی دەرونناسی ﴿ئەرجایل﴾ بەهاوکاری کۆمەڵێك لە زانایانی هاوڕێی لەو بوارەدا تاقیکردنەوەیەکیان کرد لەسەر ئەوەی کە کاردانەوەی قسەکەر چۆن کاریگەردەکاتە سەری ئەگەر توانای بینینی ئامادەبوانی نەبێت و سەیریان نەکات بۆ ئەم مەبەستەش سێ ڕێگای تاقیکردەوە لەسەر ئامادەبوان.

ڕێگەی یەکەم: عەینەکێکی تاریکی کردە چاوی گوێگران.

ڕێگەی دووەم: ڕوخساریانی بە دەمامکێك داپۆشی بە جۆرێك تەنها چاویان بەدەرەوە بو.

ڕێگەی سێیەمیش بەتەواوی ڕوخساریانی بەدەمامکەکەو چاویلکە ڕەشەکەدا پۆشی.

له کۆتایدا دەرکەوت لە هەرسێ حاڵەتەکەدا قسەکەرەکە زۆر دڵنیانەبو لەوەی پەیامەکەی گەیاندبێت  چونکە کاریگەری ڕوخساری ئامادە بوانی لەسەر بابەتەکەی بەدی نەدەکرد.

تێبینی : نابێت سەیرکردنەکە زۆر بخایەنێت بەڵکو تەنها پێویستە بۆ چەند چرکەیەك بێت چونکە کەسانێك هەن بەزۆر سەیرکردنی بێزار دەبێت .

ونبونی پەیوەندی لەگەڵ گوێگر لە ڕێگەی چاوەوە لە یەکەم هەنگاوتدا ون بونی گرنگیدانی گوێگرە بە باتەکەو بەردەوام بونی لەگەڵت.

## ڕێگاکانی پەیوەندی لەگەڵ گوێگر جگە لە قسەکردن

١- پەیوەندی لە ڕێگەی چاوەکان

٢- خەندەیی ﴿ڕوخۆشی﴾

٣- گرنگیدان

٤- گونجاندن

٥- هێمنی

## هەندێك لە ڕێگریەکانی پەیوەندیکردن :

١- شڵەژان و تێکچون و خێرایی لە نمایشکردن.

٢- گرنگی نەدان بە کاردانەوەی بەرامبەرەکان.

## ڕەوشتەکانی قسەکردن و نمایشکردن:

١- سوربە لەسەر نەپچڕاندنی بابەتەکە.

٢- مەڵێ کاتەکە تەواوبو، بەڵکو بڵێ: دەستان خۆشبێت و سوپاسی ئامادەبونتان و گوێگرتنتان دەکەم.

٣- فەرمان دەرمەکە.

٤- کەس شەرمەزارمەکە سورمەبە لەسەر قسەکردنی لە بەردەم ئامادەبواندا.

٥- خۆبەدورگرتن لە برینداركردنی هەستەکان ﴿ئاینی - سیاسی – کۆمەلایەتی .... هتد﴾

کاریگەری هەستە جۆراوجۆرەکان لەسەر کرداری نمایشکردن:

تاچەند نمایشەکەت بەکارهێنانی هەستەکانی لە خۆی گرت لە بیرنەچونەوەو کاریگەری بابەتەکە لەسەر ئامادەبوان زیاتر دەبێت.

خشتەیەك لەسەر کاریگەری هەستەکان لەسەر کرداری نمایش

١. مرۆڤ بەتەنها ڕێژەی ٢٠٪ ی ئەوشاتنەی لە بیردەمێنێتەوە کە دەیخوێنێتەوە.
٢. ڕێژەی٣٠٪ ی ئەو شتانەی لە بیردەمێنێتەوە کە دەیبیستێت.
٣. ڕێژەی٤٠٪ ی ئەو شتانەی لە بیردەمێنێتەوە کە دەیبینێت.
٤. ڕێژەی٥٠٪ ی ئەو شتانەی لە بیردەمێنێتەوە کە وتویەتی.
٥. ڕێژەی٦٠٪ ی ئەو شتانەی لە بیردەمێنێتەوە کە بەکرداری دەیکات.
٦. بۆ ئەوەی ڕێژەی سودوەرگرتنت بگاتە٩٠٪ پێویستە ئەو کردارانەی لای سەرەوە هەمویان جێبەجێ بکەیت ﴿خوێندنەوە- بیستن – بینین - کرداری کردن ﴾

## بنەماکانی بازاڕدۆزی ڕاهێنەر:

ئەو شتەی پێویستە یەکەم جار ڕاهێنەر تێبینی بکات لە بابەتی بازاڕسازی ڕاهێنەر، پێویستە بە بیرکردنەوەی دەزگایەکی گەڕۆك بیربکاتەوە، چونکە لە ڕاستیدا تۆ بریتیت لەوە بەرهێنەرێك هەروەك وەبەرهێنەرەکانی تر دەتەوێت کۆمەڵێك لە خەسڵەتەکانی وەبەرهێنانەکەت پێشکەش بکەیت بە کۆمەڵگا بۆیە دەبێت زۆر ژیرانە خۆت ماندوبکەیت لە داڕشتنی سەرچاوەکانی بابەتەکەت بۆ ئەوەی ناساندنی بازاڕسازی لە خۆتدا جێبەجێ بکەیت .

### پێناسەکەی :-

بریتیە لە فرمانێکی کارگێڕی و چەند هەنگاوێك ئامانجیان دروستکردنی «داهێنانێکە»و ڕونکردنەوەو گەیاندنی ئەو بەهرە بەنرخەیە بە دەستی کڕیارەکان «کۆمەڵگا - سەنتەرو ڕێکخراوەکانی ڕاهێنان» و بەڕێکردنی پەیوەندیەکان بە ڕێگایەکی ئاسان بۆ هەمو لایەنەکان .

دەتوانین بەشێوەیەکی تریش پێناسەی بکەین:- بریتیە لە توانای ڕاهێنەر لە شیکردنەوەی بازاڕ بۆ دروستکردن و پێشخستنی خزمەتگوزاریەکانی ڕاهێنان کە پێویستی پێیەتی بە بەکارهێنانی سیاسەتی دانانی نرخێکی گونجاوو بەستنی پەیمان لەگەڵ ناوەندە گونجاوەکانی ڕاهێنان و نەخشەکێشانی پێداویستیەکانی پەیوەندیەکە خاوەنی کارامەیەکی بەرزبێت.

له پێناسەکانی پێشووەوە هەندێك لەو ﴿مەهارانە﴾ بنەڕەتیانەمان بۆ دەردەکەوێت کە ڕاهێنەر پێویستی پێیەتی بۆ ئەوەی بۆ چونە ناو بازاڕەکان سەرکەوتوبێت:

- توانای شیکردنەوە ﴿قوە التحليل﴾.
- توانای داهێنان.
- توانای پلاندانان.
- توانای پەرەپێدان.
- توانای نرخپێدان.
- توانای وێنەکێشانی ئەو سیاسەتانەی هەبێت بۆ گەیشتن بە شوێنە جیاوەزەکان.
- توانای پەرەپێدانی پێویستیەکانی ڕاهێنانەکەی هەبێت.
- تێکەڵەی بازاڕسازی کاریگەر بۆ ڕاهێنەر ﴿المزيج التسويقي الفعال للمدرب﴾.
- پڕۆگرامی ڕاهێنانەکە.
- سیاسەتی دانانی نرخی گونجاو.
- دیاریکردنی سەنتەرو ناوچە ئامانجدارەکان.
- دروستکردنی ئامێرەکانی بانگەشەکردن ﴿صناعه ادوات الترويج المحترفه﴾.
- پەیمانبەستن لەسەر داهاتەکان ﴿التعاقد على المخرجات﴾.

## شیکردنەوەی بازاڕدۆزی ڕاهێنەر

گرنگە بۆ ڕاهێنەر، پێداویستیەکانی شیکردنەوەی بازاڕ بە شێوەیەکی باش بناسێت، بۆ ئەوەی توانای شیکردنەوەی پێداویستیەکانی ڕاهێنانی هەبێت چونکە پێداویستیەکان بەپێی ڕۆڵەکان دەگۆڕدرێت ﴿وانەبێژ- شارەزا- ڕاوێژکار﴾.

### سێ جۆری سەرەکی، پێداویستیەکانی ڕاهێنان لە یەکتر جیادەکاتەوە:

**١- پێداویستی بۆچونی﴿الحاجات الافتراضیة﴾:**

ڕاهێنەر ئەگەر بڕیاری دابو ڕۆڵی ﴿وانەبێژ﴾ ببینێت، ئەوا هەوڵی کارکردندەکات لەسەر تەوەرەی دۆزینەوەی ئەو کێشانەی لە کۆمەڵگادا ڕۆژانە ڕودەدات ئەویش لە ڕێگای چاودێریکردن و تێبینی ورد لەسەر هەڵسوکەوت و کاری ڕۆژانەیان، پاشان دێت لە شێوەی بەرنامەیەکی ڕاهێنانی جەماوەریدا دارشتنی بۆ دەکات بە ئامانجی گۆڕینی بۆچون و ڕەفتارەکانی کۆمەڵگا بەرەو ئاستێکی ڕۆشنبیری تر.

ڕاهێنەر لێرەدا پێویستی بە کارامەیی و لێزانێکی زۆر بەرز هەیە چونکە داوای لێکراوە بیرو بۆچونەکانی بگەیەنێت بە هەزارەها کەس ! لە یەك کاتدا.

لەم حاڵەتانەدا دەتوانرێت ناونیشانی بەرنامەی ڕاهێنانەکە یەکێك بێت لەم ناونیشانانە:- بۆ نمونە:

- دە کلیلی سەرکەوتن.

- هێزی زاڵبون بەسەرخۆتدا.
- هێزی لێبوردەیی و خۆشەویستی.
- ژیانێك بەبێ دڵەڕاوکێ.
- تواناکانت بخەرەگەڕو دوارۆژی خۆت دیاریبکە.
- حەوت نهێنیەکەی هێزی کەسایەتی.
- هێزی باوەڕبون بەخۆت.
- هێزی عەقڵی ناوەوە.

٢- پێداویستی ڕاستەقینە:

لێرەدا ڕاهێنەر لە ئاستی ﴿ڕاوێژکار یان شارەزا﴾دایە ناتوانێت دەستهەڵبگرێت لە لێکۆڵینەوەی ڕاستەقینەیی بۆ پێداویستیەکانی ئەو ڕاهێنانەی دەیەوێت بازاڕی بۆ بکات.

ئەم جۆرە ڕاهێنانە بەتایبەت دەناسرێت نەك بەگشتی چونکە کۆمپانیاو ڕێکخراوو دەزگاکان ئامادەیی پەیمان بەستنیان نیە لەگەڵ ڕاهێنەرێك ئەگەر نەزانن بەڕێژەی ١٠٠٪ کارمەندەکانی لەو خولی ڕاهێنانە سودمەند نەبن.

بۆیە لەم جۆرەیان لە ڕاهێنان پێویستە ڕاهێنەر لە ڕێگەی ﴿چاوپێکەوتن - زانیاری کۆکردنەوە - تێبینیەکان... هتد﴾ پلان بۆ خولی ڕاهێنانەکەی دابنێت.

هەندێك لەو ناونیشانانەی ڕاهێنەر دەتوانێت بەکاری بهێنێت لە خولە ڕاستەقینەکان:

- پلانی ستراتیژی بۆ دەزگاکان.
- ستراتیژیەکانی دروستکردنی وێنەیەکی بیرکردنەوە.
- نهێنیەکانی جیاکردنەوە لە خزمەتکردنی کڕیارەکان.
- پێشکەشکاری بە بەرنامەکانی تەلەفزیۆن.
- هونەری بەڕێوەبردنی تیمی کارکردن.
- ئامادەکردنی پلان بۆ بازاڕسازی.

**٣- ئەو پێداویستیانەی لە کاتی گەشەکردنیدا بەرهەم دێن**

بۆ بەکارهێنانی پێداویستیەکان و ئامێرەکان یان بۆ گۆڕینی سیاسەتێك بەکاردێت بۆ نموونە :

- گۆڕینی شێوازی کارکردن لە میوانخانەیەکی سێ ئەستێرەیی بۆ ئاستی میوانخانەیەکی پێنج ئەستێرەیی.
- گۆڕینی سیستەمی گواستنەوەی کاڵا بە کۆمپیوتەر بۆ سیستەمێکی پێشکەوتوتر لە سیستەمە کۆنەکە.

# جۆرەكانی بازاڕسازی




ناوخۆیی: لە سنوری ئەو پارێزگایەدا دەبێت كە ڕاهێنەر تیایدا دەژی.

نیشتمانی: جێبەجێكردنی هەمو ئەو پێداویستیانەی سەنتەرو ڕێكخراوەكانی وڵاتی ڕاهێنەرەكە پێویستیان پێیەتی.

عەرەبی: ڕاهێنەر لەسەر ئاستی وڵاتە عەرەبیەكان خواستی ڕاهێنانی سەنتەرە جۆراو جۆرەكان جێبەجێدەكات.

نێودەوڵەتی: ڕاهێنەر خواستی پێداویستیەكانی ڕاهێنان بەدی دەهێنێت بۆ زیاتر لە یەك دەوڵەت لە كیشوەرەكەیدا.

جیهانی: ڕاهێنەر خواستی پێداویستیەکانی ڕاهێنان بەدی دەهێنێت بۆ زیاتر لە کیشوەرێك.

ئامانج لە دو شیکردنەوەکەی پێشو ﴿شیکردنەوەی پێداویستیەکان + شیکردنەوەی بازارسازی ﴾ خۆیان لەم دو هاوکێشەیەدا دەبیننەوە:

پێداویستی + بازار = جۆری بەرنامەی ڕاهێنان.

## تایبەتمەندیەکانی ڕاهێنەر

سیفاتە هاوبەشەکانی نێوان ڕاهێنەرە بەناوبانگەکان

- توانای کاریگەریکردن
- توانای قەناعەت پێهێنان
- شارەزایی لە بنەماکانی ڕاهێنان و بەردەوام جێبەجێکردنی
- هاوسەنگی
- دانایی
- گۆڕینی قەیرانەکان بۆ هەل

## حەوت نەریتە بەناوبانگەکەی ڕاهێنەرە سەرکەوتوەکانی جیهان

١- پێشتر خۆئامادەکردن
٢- ڕیکوپێکی و جوانی جلوبەرگ و ڕوخسار بەبێڕۆچون
٣- وەفاداری بۆ پەیمانەکان
٤- توندوتۆڵی و تۆمارکردن
٥- خوێندنەوە

٦- ڕێزگرتنی کات

٧- وەڵام دانەوەی خێرا

## دروستکردنی کەسایەتی ڕاهێنەر

دروستکردنی کەسایەتی و بەناوبانگ کردنی ڕاهێنەر لە سەرەتاوە بەدروستکردنی هەست و وێنەیەکی جوانی ڕاهێنەر لە مێشکی گوێگردا دەستپێدەکات ئەگەر سەرکەوتوبو ئەوا وردە وردە بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیك ناوبانگ دەردەکات، وەك مارکەیەکی بازرگانی لێدێت و پارەی خۆی دەکات وەك ئەستێرە بەناوبانگەکانی جیهان لە بوارە جیاجیاکاندا

﴿ سینەما - تۆپی پێ – ڕاهێنەر - سیاسەت ..... هتد ﴾

## گرنگترین نهێنییەکانی دروستکردنی مارکەیەکی کەسایەتی بریتین لە :

١. دەستپێشخەری: دەستپێشخەری بکە لە داهێنانی پڕۆژەی نوێ و دەستپێشخەریش بە لە تێکەڵ بونت بە پڕۆژە بەهێزەکان.

٢. پەیوەندیەکان: هەستە بە دروستکردنی تۆڕێکی بەهێز لە پەیوەندی پارێزگاری لە پەیوەندیەکان بکە ئەگەر ناکۆکیەکیش لە نێوانتاندا ڕویدا.

٣. هاندان: کارمەندەکانت لەسەر سەرکەوتن هانبدەو سەرکەوتنی ئەوان بەهی خۆت بزانە.

٤. بەردەوامبون: هەوڵبدە بەبەردەوامی پەیوەندیت لە گەڵ ڕاهێنراوەکانتدا هەبێت و کاتێك پێویستیان بە یارمەتی تۆ بو یارمەتیانبدە. با دروشمت بریتی بێت لە: ﴿وەلاّمدانەوەی خێرا لە سنوری توانا.﴾

٥. قۆستنەوەی هەلەکان: یەکەم هەل کە دێتە ڕێگات لە دەستخۆتی مەدەو مەهێلە لە هەلی یەکەمیشدا بووەستیت بەلاّم داوای هەلی دووەمیش مەکە .

٦. ڕێزلێگرتن: زۆرباوەڕت بەخەرافیاتی ڕاهێنەرە گەورەکان نەبێت لەوانەیە ئەوەی لە دەریاچەدا دەستت دەکەوێت لە دەریادا نەبێت , ڕێزلێگرتن و ئالّوگۆر بکە لەگەڵ دەوروبەرتداو دیواری گەورەیی و خۆبەزلزانین دروستمەکە لە نێوان خۆت و خەڵکیدا با ڕاهێنانەکانت وەك ڕاهێنەرە گەورەو بەناوبانگەکان بە کرداری بێت نەك تەنها بە دروشم.

٧. ڕێکوپێکی لە ڕوخسارو جلوبەرگتدا: گوێگر پێش گەیشتن بە ئەقڵت دەگات بە جلوبەرگ و ڕوخسارت بۆیە پێویستە گرنگیەکی باش بە ڕوخسارو جلوبەرگەکانت بدەیت بەبێ ڕۆچون چونکە چاوەڕوانی پۆشینی جلوبەرگی گرانبەهات لێناکەن بەڵکو چاوەڕوانی ڕێزت لێدەکەن.

٨. دروستکردنی چیرۆك: توانایی و لێهاتویت لە ڕاهێناندا بکە بە چیرۆکێك تا خەڵکی پشتاوپشت باسی بکەن و سودت لێوەربگرن.

۹. **پەیوەندی کۆمەڵایەتی:** لایەنی کۆمەڵایەتیت لەگەڵ دەوروبەرتدا تا دەتوانیت بەهێزی بکەو هەلەکان لە دەستخۆت مەدە لە ڕێگای پێداویستیە تەکنەلۆژیەکانەوە پەیوەندیت پتەو بکە وەك ﴿مۆبایل تۆڕی کۆمەڵایەتی facebook- تویتەر...... هتد﴾

۱۰. **ڕاگەیاندن:** لە وانەیەلە ڕێگەی بەرنامەیەکی چاوپێکەوتن لە تەلەفزیۆنەوە ناوبانگێکی باش دەربکەیت و زۆرترین گوێگرت هەبێت ئەگەر ئەو هەلەشت بۆ نەڕەخسا ئەوا لە یوتوب شتی خۆت تۆماربکەو بلاّوی بکەرەوە.

۱۱. **فێربونی بەردەوام:** وەك تیژکردنەوەی دانی مشار وایە چۆن هەمیشە هێزو توانای پێدەدات بۆ داربڕینەوە بەهەمان شێوەش فێربونی بەردەوام هەمیشە هێز و تواناکانت پەرە پێدەدات.

۱۲. **هونەری گوزەری ناسراو ﴿فن اختراق المالوف﴾:** فێری بویت و بۆت دەرکەوت ئەوە نهێنی داهێنانە خەڵکی ماوەیەکیان دەوێت تا قەناعەت بەقسەکانت بهێنن ئەمەش بە هەلێك دەژمێردرێت بۆت وەك ڕاهێنەر.

۱۳. **تۆمارکردن ﴿نوسینەوە﴾:** نهێنی و کارێکی سەرسوڕهێنەرە گوێگرانت بەدەستدەهێنیت لە هەمو شوێنێکەوە فێری نهێنیەکانی ﴿وۆردبرس wordpress﴾ یان ﴿بلوجەر blooger﴾ ببەو دەربچۆ.

١٤. خاوەنـداریتی توانـای تایبـەتی پیشـەیی: هەولبـدە خـاوەنی زۆرترین پیداویستیەکان و ئامیرەکان بیت لە بوارەکەتدا ﴿کۆمپیوتەر، داتاشۆو.....هتد﴾

١٥. قازانج: چاوت لـەوە نـەبیت بەرامبـەرەکانت چەند قازانج دەکەن بەڵکو گرنگی بـدە بـە بەدەسـتهینانی ریـزی بەرامبـەرەکانت ئەمـەش بەگەورەتریت قازانـج دەژمیردریت بۆت.

## چونە ناو بازارە ناوخۆیەکان

ئەگەر حەزوئارەزوی ڕاستەقینەت هەبیت ئەمە کاریکی ئاسانە.

با سەرەتاکەشـی بیهیزبیـت ڕەتـی مەکـەرەوە بیـزاریش مەبـە لـەو نارەحەتیانـەی دیتـە ریگـات چـونکە حـەزوئارەزووەکانت بـۆ ئـەو کـارە بیهیزتدەکات .

## زۆرینەی پیداویستیە جیاوازەکان تاقیبکەرەوە:

- کۆبونەوە لەگەڵ هاوریـیان: کۆبونـەوە بچوکەکان لەگەڵ هاوریکانت یارمەتی دەریکی باش دەبیت بۆ شکاندنی ئەو ترسەی هەتە.
- وانەوتنـەوە: دەتوانیـت ریکـەوتنیك لەگـەڵ چـەند بەریوەبـەری قوتابخانـەو ریکخراویـك بکـەیت بـۆ پیشکەشکردنی وانـەو ناسینی خۆت وەك هەنگاوی یەکەم.
- پیشکەشـکردنی ڕاهینـان: پەیوەنـدی بکـە لەگـەڵ سـەنتەرەکانی ڕاهینان و خزمەت گوزاریەکانی خۆتیان پیشکەش بکە.

# سەرچاوەکان

١-Benjamin S.Bloom.And others, Taxonomy of Educational Objectives, Printed in the United States of America, Michigan ١٩٥٦ .

٢ – سایتی ئەکادیمیای عەرەبی بەریتانی بۆ فێربونی بالاّ لە ١١\٢\٢٠١٧

http;\\ www.abahe.co.uk\training-concept.htnl

٣ – ادرس بذكاء و ليس بجهد , كيفين بول مكتبة جرير ,ط١.د.ت

٤- اساليب و استراتيجيات التحفيز في التدريب , لمياء عبدالله الشبيبي , المملكة المتحدة , الجامعة الافتراضية العالمية ط١. ٢٠١٠ اعداد الحقائب التدريبية , فؤاد الجغيمان , لا يوجد مكان للنشر , لا يوجد دار للنشر , ١٤٣٣ ه

٥- الانطباعات الاولي , د ان ديماري و د. فاليري وايت, مكتبة جرير

٦- واقع عملية تقيم البرامج التدريبية (رسالة ماجستير).ايمن عبدالرحمن سليمان المصدر ,٢٠١٠ جامعة الازهر – غزة

٧- بناء الحقيبة التدريبية, الرياض – معهد الابداع الاداري ١٤٣٦ ه

٨- تصميم البرامج التدريبية – احمد الخطيب و عبدالله زامل العمزي – عالم الكتب – عمان –اردن ٢٠٠٨

٩- تصميم البرامج التدريبية – بلال السكارنة – دارالمسيرة – الاردن – ط١ ٢٠١١ م

١٠- تصميم البرامج التدريبية – عادل الصالح – مطابع معهد الادارة – ١٤٢٢ ه

١١- تصميم الحقائب التدريبية – عبدالله الهقاص – لا يوجد مكان للنشر – لا يوجد دار للنشر ١٤٢٣ ه

١٢- تصميم الحقيبة التدريبية – صالح محمد الربيعة – نشرة اثرائية – ١٤٢١ ه المجمعة

١٣- دليل المهارات الاساسية لتدريب المعلمين – عمر حسن الشيخ – الجامعة الاردنية – عمان – الاردن – ايلول ١٩٩٢

١٤- حديثك هو طريقك للقمة – كيفين هوجان – مكتبة جرير ط١ ٢٠٠٧ م

١٥- الحقائب التدريبية – احمد محمد بو زبر – ٢٠١٤

١٦- الخطابة عند الفاروق – عبدالله علي جابرالمري – رسالة ماجستير غير منشورة – جامعة الشرق الاوسط – ٢٠١٢ م

١٧- دليل اعداد حقيبة المادة التدريبية – د عبداللطيف بن صالح – د صالح الغامدي – د سعيد عبدالله القرني – لا يوجد مكان للنشر – لا يوجد دار للنشر

١٨- التدريب والتدريس الابداعي – طارق السويدان – شركة الابداع الفكري – ط٢ ٢٠٠٦ م

١٩- موسوعة التدريب والتنمية البشرية – عبدالرحمن توفيق – مركز الخبرات المهنية للادارة بميك – القاهرة ٢٠٠٧ م

٢٠- نظريات التعليم – علي حسين حجاج – سلسلة كتب عالم المعرفة – رقم ١٠٨ الجزء الثاني ١٩٨٦

٢١- العملية التعليمية – عبدالرحمن توفيق – مركز الخبرات المهنية للادارة – القاهرة – ١٩٩٤

٢٢- فن الالقاء الرائع – طارق السويدان – شركة الابداع الفكري – ط١ ٢٠٠٢ م

٢٣- فن الالقاء – عبدالوارث عسر – الهيئة المصرية العامة للكتاب – ط١ – ١٩٩٢ م

٢٤- كتاب الخطابة – لابن رشد

٢٥- الكفايات الست للمدرب الفعال – محمد البيشي – الرياض – البيشي للاستشارات والتدريب.

# ژیاننامەی نوسەرانی ئەم پەرتوکە

## مامۆستا طلال الصغیر


لە دایکبون : ١٩٧٣\٢\١٨

شوێنی لە دایکبون : تەرابلس – لوبنان

ڕەگەزنامە : لوبنانی

باری خێزانی : خێزاندار

پەیوەندی کردن :

ژمارەی تەلە فون : ٠٠٩٦١٦٤١٢٢٨٤

ژ . موبیل : ٠٠٩٦١٧٠٧٢٢٢٤٠

ئیمەیل : talalsaghir@gmail .com


سیفاتەکانی

- مامۆستای زانکۆیە لە بابەتی (ڕێگاکانی وانەوتنەوە و بونیاتنانی پرۆگرامەکان)
- سەرۆکی دەستەی کارگێڕی ئەکادیمیای جیهانییە ( GATQ)
- سەرۆکی سەندیکای ڕاهێنەرە بەتواناکانە (المدربین المحترفین ) لە لوبنان
- ڕاهێنەرێکی باوەڕپێکراوە (معتمد) لە ئامادەکردن و پێگەیاندنی ڕاهێنەران

١- ڕاهێنەری پێشکەوتو (ئیلاف ترەین )

٢- ڕاهێنەری باوەڕپێکراو ( UN HABETAT)

٣- ئەکادیمیای بەریتانی HRD

٤- سەنتەری کەنەدی (ڕاهێنەری یارمەتیدەری دکتۆر ئیبراهیم فەقێیە خوالێی خۆش بێت )

٥- ئەکادیمیای جیهانی (GATQ)

٦- سەنتەری جیهانی کەنەدی بۆ ڕاهێنان

- ڕاهێنەرێکی پسپۆڕی ڕێگەپێدراوەو ڕاوێژکاریشە لە ئامادەکردنی پاکێجەکانی ڕاهێنان لە لایەن سەنتەری جیهانی کەنەدی بۆ ڕاهێنان CGC

ئامانجی

بەرزکردنەوەو پەرەپێدانی توانای ڕاهێنەران و دەزگا پەروەردەییەکان – بەکارهێنانی تواناکانیان بۆ بەرزکردنەوەی بەرهەمی ڕاهێنانەکە بە کەسی لە ڕوانگەی کارگێڕی و پەروەردەییش .

ئەو وڵاتانەی خولی ڕاهێنانی تیادا وتوەتەوە :

لوبنان - جەزائیر- تورکیا - قەتەر - دوبەی- مەغریب - تونس - لیبیا - عەممان - کوردستان - مەسقەت - عومان - میسر -بەریتانیا – مالیزیا – سوید –دانیمارك – فنلەندا.

پسپۆڕی ڕاهێنان

ڕاهێنانی پەروەردەیی و کارگێڕی و بونیاتنانی خۆیی.

# عەبدوڵلا محەمەد هەنانو

شوێنی لە دایکبون : ئەدلب – تل الكرامـه

– سوريا

لە دايكبوی : ١٩٨٥\١\٢

ڕەگەزنامە : سوری

باری خێزانی: خێزاندار

پەیوەندی كردن :

تەلەفون : ٠٠٩٦١٠١٣٠٠٩١٦

ژ. موبيل : ٠٠٩٦١٦١١٣٩٦٢٥٤

ئیمەیل : abdullahmw@gmail.com

پسپۆڕی

خاوەنی بڕوانامەی دکتۆرایە لە شەریعەتی ئیسلام – پسپۆڕی فیقهی سەردەم لە زانكۆی جینان ٢٠١٤

نوسینەكانی

١. الجريمه السياسيه فى الشريعه الاسلاميه والقوانين العربيه والقانون الدولى _ منشورات الحلبى الدولى.

٢. كن خير داع بالمشاركه – كتاب منهجى فى تدريب الدعاه

پیشەكانی

- بەڕیوەبەری سەنتەری مەهارەكانە بۆ ڕاهێنان و پەرەپێدان.
- ماموستای زانكۆیە لە بابەتی پەیوەندیە مرۆییەكان لە زانكۆی زانست و تەكنەلۆژیا AUL
- ئەندامی دەستەی كارگێڕی ئەكادیمیای جیهانیە GATQ

## مامۆستا دانا فازیل محەمەد

شوێنی لە دایکبون : هەرێمی کوردوستان – سلێمانی

لە دایکبوی : ١٩٧٤

زمانەکان: کوردی – عەرەبی ئینگلیزی



پەیوەندی

Facebook; danafazilo- دانا فازل

ئیمەیل : dana fazil@ gmail .com—danafazil@hotmail.com---danafazil@yahoo.com

ژ. موبایل ٠٧٧٠١٩١٦٧٢٨—٠٨٧٢٤٨٧٩٩٨ فایبر-واتس اب

پسپۆری

• خاوەنی بڕوانامەی ماجستێرە لە زانستی کۆمەڵناسی – زانکۆی بەیروت – لوبنان – ٢٠١٤

کارەکانی

• بەڕێوەبەری کۆمپانیای شاین پارفینە بۆ پاکێجی ڕاهێنان و ڕاوێژکاری

• سەرپەرشتیاری عێراقە و ئەندامی دەستەی کارگێڕی ئەکادیمی سەفیرەکانی بەرهێنانی جیهانیە- بەریتانیا (بەشداربوو دامەزرێنەرە )

• ئەندام و دامەزرێنەرە لە دەستەی کارگێڕی لە ئەکادیمیای جیهانی بۆ ڕاهێنان پەرە پێدانی تواناکان

بڕوانامەکانی لە بواری ڕاهێنان :

• ڕاهێنەری باوەڕپێکراو و ڕاوێژکاری یەکەمە لە ئەکادیمیای GATQ

• شارەزاو پسپۆڕ لە هەڵسەنگاندنی پاکێجەکانی ڕاهێنان لە سەنتەری جیهانی کەنەدی (فانکوفەر- کەنەدا )

• ڕاهێنەری باوەڕپێکراو ڕاوێژکاری یەکەم لە ئەکادیمیای سەفیرەکانی گەشەپێکردنی جیهانیە (لەندەن –بەریتانیا )

• ڕاهێنەری باوەڕپێکراوە لە لایەن سەنتەری جیهانی بۆ ڕاهێنانی بەتوانا لە تورکیا

شارەزاییەکانی

• بەشداریکردن لە کۆنگرەی یەکەم و دووەم و سێیەم و چوارەم و پێنجەمی سەنتەری جیهانی ڕاهێنانە بەتواناکان لە مالیزیاو تورکیاو ئەردەن و مادلیف) وەك نوێنەری هەرێمی کوردستان

• بەشداریکردنی لە کۆنگرەی شەشەمی ئەکادیمیا لە هەرێمی کوردستان لە هەولێر – وەك سەرۆکی دانیشتنەکان

• بەشداریکردنی وەك خاوەنی کۆمپانیا و ئەندام لە ئەکادیمیا لە کۆنگرەی هەشتەمی ئەکادیمیا لە کوالالامبور لە مالیزیا .

• وەك وانەبێژ بەشداری لە یەکەم کۆنگرەی دامەزراندنی سەنتەری جیهانی ڕاهێنانی بەتواناکان لە ئەستەنبوڵ لە وڵاتی تورکیا.

# مامۆستا مەهدی ڕەمەزانی



بڕوانامەکان

• ماستەر لە کارگێڕی کار و پسپۆڕی بازارکردن لە زانکۆی کارولینا

• پلەی خوێندنی بالاّ لە کارگێڕی کاردا

شارەزاییەکان

• لە سەردەستی مامۆستا و ڕاهێنەرە نێودەوڵەتیەکانی وەك (دوکتۆر ئیبراهیم فەقی و شارەزای جیهانی لە بواری ڕاهێنان وایت وود سمول ) پەروەردە بووەو خولەکانی گەشەپێدانی لێیانەوە وەرگرتووە .

• لە زۆر شوێن لە جیهان پلەی ڕاهێنەری باوەڕپێکراوی بەدەستهێناوە .

• مۆڵەتی دروستکردنی پاکێجەکانی ڕاهێنانی لە لایەن سەنتەری جیهانی کەنەدییەوە بەدەستهێناوە بەپێی پێوانە نێودەولە تییەکان (CRTP)

• کاری لە بواری بازاڕ و کارگێڕیدا کردووە

• خاوەنی ئەندامێتی ژمارەیەك لە سەنتەرەکانی ڕاهێنانە لە جیهاندا

• بەشداری کردووە لە دامەزراندنی ئەکادیمیای جیهانی بۆ ڕاهێنان و پەرەپێدانی تواناکان GATQ

• سەرۆکی دەستەی کارگێڕی دەزگای( قائدە) لە بازاڕکردن و ڕاهێناندا . بەهاکانی

توانایی و ڕاستگۆیی لە جیهانی ڕاهێناندا

ئەوخولانەی دەیلێتەوە

لە زوربەی وولآتانی جیهاندا خول دەلێتەوە لە سێ بواردا

١- بەرنامەکانی گەشەکردنی کەسی

٢- خولی کارگێڕی

٣- خولی ڕاهێنانی ڕاهێنەران

# ڕاهێنەری نێو دەوڵەتی : صلاح الدين جبلح



لایەنە زانستیەکانی

ماجستێر لە زانستی کوتشینغ و شوێنەوارەکانی (لە جێبەجێکردندایە )

خاوەنی فیکری پادشایی نمونەی ( THE GUTE UP MODEL) لە بواری زانستی کوتشینغدا .

خاوەنی مولکیەتی فیکریی چوارینەیە بۆ سەرکەوتن لە خوێندندا کارو فەرمانەکانی

سەرپەرشتیاری گشتی مۆندیالی عەرەبیە لە بەهێزکردنی بیر

ئەندامی بەشداربوویە لە ئەکادیمیای جیهانی بۆ ڕاهێنان و پەرەپێدان GATQ

بەڕێوەبەری گشتی کارگێری ڕێکخراوی ژیریيە لە پایتەختی ووڵاتی جەزائیر

دامەزرێنەری پرۆژەی سەرکەوتنەکانە لە بوارەکانی خوێندن کە زیاتر لە ٣٠ هەزار خوێندکار لێی سودمەند بون .

ناوبژیوانێکی نێودەوڵەتیە بە پلەی دووەم لە دەزگای تونی بوزان کە لە هەمو جیهاندا ١٢ ناوبژیوان هەن.

دامەزرێنەری یانەی عەرەبییە لە زانستی کوتشینغ

بەڕێوەبەری پرۆژەی (کوڕەکەم بیر دەکاتەوە )

بەڕێوەبەری پرۆژەکانە لە ئەکادیمیای جیهانی بۆ ڕاهێنان و پەرەپێدانی تواناکان GATQ

لایەنی ڕاهێنان

ڕاوێژكاری باوەڕپێكراوە بە پلەی یەكەم لە ئەكادیمیای GATQ
ڕاهێنــەری كەســێتییە LIFECOACH لــە پــەیمانگای ئــەوروپی بــۆ ڕاهێنانی كەسێتی ( ECI)
مۆڵەتی ڕاهێنانی كەسێتی هەیە لە لایەن ئاینا ئیجبرغ سانتلا لە لەندەن
خاوەنی ماستەرە لە زانستی NLP لە لایەن یەكێتی جیهانی بۆ زانستی NLP
لێكۆڵەرو ڕاوێژكارە لە ڕێنماییە دەرونیەكان بۆ وێنەی منالآن
پلەی شارەزایی لـە بـواری گەشـەپێدانی مرۆیـدا هەیـە لـە سـەنتەری جەراح لە دوبەی
ئەو خولانەی پێشكەشی دەكات
خولی كوتشینغ (ڕاهێنەری ژیان )
ئامادەكردنی ڕاهێنەری بە توانا
ڕاهێنەری ڕاهێنەرانە لە بواری بەرنامەی چوارینەی سەركەوتنی خوێنكار
ڕاهێنەری ڕاهێنەرانە لە بەرنامەی (كوڕەكەم بیر دەكاتەوە )
ئەو دەوڵەتانەی ڕاهێنانی تیادا پێشكەش كردوە
بەریتانیا – چین – ئیمـاراتی عـەرەبی – مالیزیـا- قەتـەر- شانشینی عوممان- سوریا – لوبنان – میسر- لیبیا – تونس مەغریب – جەزائیر.

# ژیاننامەی وەرگێڕ



ناو : پشتیوان جەمال ئەحمەد

لە دایکبوی: سلێمانی، ١٩٦٨\٧\١

ئاستی خوێندن: بڕوانامەی دبلوم

لە ڕوپێوی

کارو فەرمانەکانی

وەرگێڕانی سێ پەڕتوکی ڕاهێنەری

نێودەولەتی حوزەیفە العمقی لە بواری گەشەپێدانی مرۆیدا بەناوی

﴿باجیهان بزانێت کە تۆ هێشتا زیندویت.....کێ پێشڕەوی جیهان دەکات

...... نهێنیەکانی وتاری نایاب و هێزی باوەڕبون بەخۆت﴾

ئەندام لە ڕێکخراوی ماڵی هەموان وەك پەروەردەکار

ئەندامی ئەکادیمیای جیهانی بۆ ڕاهێنان ﴿GATQ﴾ وەك ڕاهێنەر لە

بواری گەشە پێدانی مرۆیدا

ئەندامی بۆردی نەرویجی بۆگەشەوڕاهێنان

دامەزرێنەروسەرۆکی تۆڕی ڕاهێنەرانی کوردستان

ئەندامی ناوەندی ئیعجاز بۆ زانستی قورئان .

پەیوەندی

ژ. موبایل : ٠٧٧٠١٤١٥٨٢٤........٠٧٥١٨٦٠٠٣٥٢

ئیمۆوڤایبەر وواتس ئەپ : ٠٧٧٠١٤١٥٨٢٤

F.B : pshtiwanjamal

ئیمیل: PSHTIWAN١٩٦٨ @YAHOO.COM

## ناوەڕۆك

# Training of Trainers (TOT) fundamentals

بابەتی ڕاهێنان یەکێکە لە بابەتە نوێیەکان لە کتێبخانەی کوردیدا، بە تایبەتی بۆ ئەو کەسانەی دەیانەوێت ڕاهێنان بدەنەوە و بە شێوەیەکی کرداری و سەردەمیانە، بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی چالاکانە پرۆسەکە بە ڕێوە بەرێت.

ڕاهێنان بریتیە لە (بەخشینی زانیاری و گۆڕینی بۆ چوون و فێرکردنی مەهارە)، جا کەسی ڕاهێنەر بۆ ئەوەی بە تەواوی کاری ڕاهێنان بەڕێوە بەرێت، دەتوانێت سوود لەم سەرچاوەیە وەربگرێت و دەرئەنجامی کارەکەی زیاد بکات بە شێوەیەکی پراکتیکی گۆڕانکارییەکان دروست بکات.




نرخ: ٣٥٠٠